٩٥٣,٢١٢
س ٨٤٥ سدیق سالْح
حکوومەتی کوردستان (١٩١٨-١٩٢٤)/ نووسینی سدیق سالْح.
سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٦.
١٩٠ل: (١٤,٨٥ × ٢١ سم)، نەخشە.
١- کوردستان- مێژوو ٢- حکوومەتی کوردستان ١٩١٨-١٩٢٤
٣- ناونیشان
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پۆلێن و پێرستی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق سالْح

زنجیرە: ٤٨
کتێب: حکوومەتی کوردستان ١٩١٨-١٩٢٤
نووسەر: سدیق سالْح
مۆنتاج: سیروان خەلیل محەمەد
بەرگسازی: قادر میرخان
خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
تیراژ: ١٠٠٠
چاپ: دووەم
ژمارەی سپاردن: ٦٨٣ی ساڵی ٢٠٠٦
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

# بنکەی ژین

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستان: سلێمانی، سەرچنار، گەڕەکی ١١٩، شەقامی ٧٥ سەگرمە، خانووی ٧٣
نۆرماڵ: ٢١٨٣٦٣١ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٢ سانا: ١١٢٨٣٠٩
سندووقی پۆست: ١٤ E. Mail: bnkaizhin@yahoo.com

## سەرنج:

ئـەم بابەتـە هەوڵێکـە، پـشت بەسـتوو بـە سەرچـاوەی مێـژوویی‌ی جیاجیـا، بـۆ بەڵگەنامەسـازی (توثیـق)ی وردەکاریـەکانی مێژووی (حکوومەتی کوردستان) کە ساڵانی ١٩١٨-١٩٢٤ لە سێ ماوەی پچڕپچڕدا لە ناوچەی سلێمانی بە سەرۆکایەتی‌ی شێخ مەحموودی حەفید دامەزرا. ئەم دووەم چاپە، لێزیادکراوە.

# حکوومەتی کوردستان

### ١. ساغکردنەوە؛

#### ١.١. زاراوە:

ئەو حوکمە کوردییە کە شێخ مەحموودی حەفید، دوای بڕانەوەی یەکەم جەنگی جیهانی، لە سێ دەوری پچڕپچڕدا پێکی هێنا، لەو سەرچاوانەدا کە لەبارەیانەوە نووسیوە و پێویستم نەبینی ڕیزیان بکەم، بە ناوی جیاوازی وەك حوکمدارێتیی کوردستان یا کوردستانی جنووبی، حکوومەتی کوردستان یا کوردستانی جنووبی یا باشوور، دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، حوکم یا ئیدارەکەی شێخ، مەجلیسی ئیدارەی کوردستان یا لیوای سلێمانی، ناوبراوە.

لەکاتێکدا ڕۆژنامەوانیی کوردیی زمانی حاڵی ئەودەسەڵاتەو نووسراوی دائیرەکانی ئەو ڕۆژگارەو ئیرادەنامەکانی شێخ خۆی، لە هەرسێ دەورانی حکوومەتەکەدا، ڕاست وایە هەر بە (حکوومەتی کوردستان) ناساندوویانە. بۆیە ڕاست وایە (حکوومەتی کوردستان)ی پێ بوترێ. ئەم نموونانە، بۆ بەڵگەی دروستی، ئەهێنمەوە:

١- ئیرادەنامەی نمرە (١٧٠)ی (٨ی جیمادیل ئەووەلی ١٣٣٧- ٨ی شوباطی١٩١٩)ی حوکمداری کوردستان "مەحموود" بۆ (ڕەئیسی عولەمای عیراق مەلا عەبدولقادرزادە فەضیلەتمەئاب جەنابی مەلا حسێن

دام فضله العالي)، به دەق نووسیویه: ((لە سایەی لوطفی خوداو بە یاوەریی حەضرەتی پەیغامبەری ئەنام و بە یاریی ئەنبییاو ئەولیای کیرام لە تەحتی حیمایەتی دەولەتی علییەی بریتانیادا حکوومەتی جەدیدەی جەلیلەی کوردستان تەشەکولی کردووە ...))[1].

٢- ڕۆژنامەی "بانگی کوردستان"[2]:

* ژ١٠، ١٥ تشرین اول ١٩٢٢، ل١:

صوورەتی ئیرادەی علییەی حەضرەتی حوکمداری: عەدەد ١، ١٩ی صەفەرول خەیری ١٣٤١– ١٠ی تشرین ئەووەلی ١٩٢٢ لە مەملەکەتی سلێمانیدا نووسرا.

بۆ تەشکیلاتی حکوومەتی کوردستان نەصب و تعیینی ئەم ذاتانە لە قابینەی حکوومەتدا موناسیب دەبێ.

* هەمان ژمارە، ل٢:

- موفەتیشی عوموومیی حکوومەتی کوردستان میرلیوا صدیق القادری پاشا.

* هەمان ژمارە، ل٤:

---

[1] نموونەی ئەم ئیرادەنامەیەم لە مامۆستا شەهابی ڕەمزیی مەلا مارفەوە دەست کەوت، سوپاسی ئەکەم.

[2] ڕەفیق سالح، ڕۆژنامەکانی سەردەمی حوکمی شێخ مەحموود، لەسەرنووسینی سدیق سالح، سلێمانی، ٢٠٠٣.

لێرەبەدوا کە ئاماژە بۆ ڕۆژنامەکانی "بانگی کوردستان"و "ڕۆژی کوردستان"و "بانگی حەق"و "ئومێدی ئیستیقلال" کرا، لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە.

تەعین: مەشهوور ڕەسووڵ ناجی ئەفەندی کە لە ئەڵەبجە مەئمووری دەیەك بوو لەسەر ئیعلانی حکوومەتی کوردستان کە گەڕاوەتەوە سلێمانی ....

* ژ١٢، ٢٧ تشرین اول ١٩٢٢، ل١:

ئیرادەی حوکمداری عەدەد ٣، ٢٤ی صەفەری ١٣٤١، ١٥ی تشرین ئەووەلی ١٩٢٢ پایتەختی حکوومەتی کوردستان لە سلێمانیدا نووسرا.

* هەمان ژمارە، ل٢:

صوورەتی ئیرادەی علییەی جەنابی حوکمداری کوردستان عەدەد ٤،٣٠ی صەفەری ١٣٤١- ٢١ی تشرین ئەووەلی ١٩٢٢ پایتەختی حکوومەتی کوردستان لە سلێمانیدا نووسرا.

* هەمان ژمارە، ل٦:

ئاسایشی داخلی: لە مەرکەزی حکوومەتی کوردستان یەعنی سلێمانیدا لە سایەی هیممەتو عەزمی نولوول ئەمرەوە ....

* ژ١٣، ٣ تشرین پانی ١٩٢٢، ل٣:

تەشەکورو بەیانی مەمنوونییەت: وارستەی عەرضو بەیانە کە جەنابی مەندووبی سامیی حکوومەتی فەخیمەی بریتانیا کە لەبەغداوە بۆ ناردنەوەی حەضرەتی (حوکمداری کوردستان) دام شوکتە بەذلی هیممەتی فەرموو ر ئێستایش بۆ ئینتیظامی حکوومەتی کوردستانو ئیلحاقکردنی ئەو جێگایانە کە داخلی کوردستانن بە سلێمانی مەشغووڵە.

ڕەئیسی شەرعو عەدل: لە هەیئەتی ڕوئەسای (قابینە) حکوومەتی کوردستاندا تائێستا ڕیاسەتی شەرعو عەدل بە وەکالەت ئیفا ئەکرا ....

٣- ڕۆژنامەی "ڕۆژی کوردستان":

* ژ۱، ۱٥ تشرين ثانى ۱۹۲۲، ل۲:

ئەگەر بە نەظەری ئینصاف تەماشای ڕاست و چەپ و ئیستیقبالی خۆیان بکەن لێیان مەعلووم ئەبێ کە تەشەکولی حکوومەتی کوردستان لە هەموو خوصووصێکەوە صەد هەزاران خێر و خۆشیی بۆ عیراق تێدایە و ....

* هەمان ژمارە، ل۳:

۱- حەضرەتی شێخ قادر ئەفەندی‌ی سوپەهسالاری کوردستان تەرفیعەن بۆ ڕەئیسول ڕوئەساو نایبی حکوومەتی کوردستان ئینتخاب و تەعین کرا.

* ژ٥، ۲۰ کانون اول ۱۳۳۸، ل۳:

سیاسەتی ئەمڕۆ: حکوومەتی کوردستان کە ئەمڕۆ شوکور لە عالەمی بەشەرییەت و ئینسانییەتدا شان و شەرەفێ و لە ڕووی زەمیندا ناونیشانێکی بۆ خۆی پەیدا کردووە ....

* هەمان ژمارە، ل٤:

مەفرەزەی عەسکەرییە و پۆلیس کە لە مەرکەزی حکوومەتی علییەی کوردستانەوە بۆ چەمچەماڵ ئیعزام کرابوون ....

٤- سەراوردی نووسراوی ڕەسمی و مامەڵەپێکراوی دائیرەکانی سەردەمەکە، ناوی (حکوومەتی کوردستان) یان لێ دراوە. نموونەی ئەوە، ئەوراقی تاپۆی مانگی تشرینی دووەمی ۱۹۲۲ی خانوویەکی گەڕەکی گۆیژەیە کە بە فۆرمی (طابو شکل ۱٥) و ناوی (حکوومەتی کوردستان) کراوەتەوە.

٥- (بۆردرۆی مەعاشاتی مانگی نیسانی ۱۳۳۹ی مەفرەزەی موحافیظی سواری- مایس ۱۹۲۳/۱۳۳۹)، ئەمە لە دامێنی حەوتەم

لاپەڕەیدا نووسراوە: ((وەکوو لەسەرەوە نووسراوە بۆ مەعاشی مەفرەزەی موحافیظی سواری پێنج هەزارو هەشتصەدو شەستویەك ڕووپییە لە خەزێنەی حکوومەتی کوردستان وەرگیرا))[3]. پێبەپێ، ناوەکانی سوپەهسالارو ڕەئیسول ڕوئەساو نایبی حکوومەتو ڕیاسەتەکانو موفەتیشی عموومیو قوماندانی عەسکەر، هەر "کوردستان"یان خراوەتە سەر، نەك کوردستانی جنووبی، یا شتێکی تر[4]. نموونەیەکی دیاری ئەوە، نووسراوی ژمارە (٥٩٠/٦/٧)ی ڕۆژی (١٦ کانون اول ١٣٣٨)ی (ڕیاسەتی داخلییەی کوردستان)ە سەبارەت بە دانانی مەلا مەعرووفی مەلا ڕەسووڵی سیرێ بە وەکیلی شەرعو عەدل[5].

شێخی گەورە، هەر لە یەکەم حکوومەتی کوردستانەوە تا مانگی تشرینی یەکەمی دەورانی دووەم حکوومەت، بە (حوکمداری کوردستان) خۆی ناساندووە[6]. هەتا مۆری تایبەتی خۆیشی، (حاکم کردستان

---

[3] سدیق ساڵح، (مەفرەزەی موحافیظی سواری- مایسی ١٩٢٣) لە بەڵگەنامەیەکدا ،"هەزارمێرد" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ١٨، کانوونی یەکەمی ٢٠٠١، ل٥٠-٧٣.

[4] ڕۆژی کوردستان، ژ١، ١٥ تشرین ثانی ١٩٢٢، ل٣؛ ژ٣، ٦ کانون اول ١٣٣٨، ل٤؛ ژ١٢، ١٠ شباط ١٣٣٨، ل٣.

[5] سدیق ساڵح، بەڵگەنامەیەکی دووەم حکوومەتی کوردستانی باشوور، "هەزارمێرد"، ژ٦، کانوونی یەکەم ١٩٩٨، ل١٢٠-١٢٥.

[6] بانگی کوردستان، ژ١٠، ١٥ تشرین اول ١٩٢٢، ل١-٢؛ ژ١٢، ٢٧ تشرین اول ١٩٢٢، ل٢؛ ژ١٣، ٣ تشرین ثانی ١٩٢٢، ل١؛ ڕۆژی کوردستان، ژ١، ل٢.
بەڵگەیەکی بەردەست بۆ ئەو دوایین ماوەیە، (صوورەتی ئیرادەی علییەی جەنابی حوکمداری کوردستان عدد ٣٠٤، صفر ١٣١٤، ٢١ تشرین اول ١٩٢٢)ە لە "بانگی کوردستان، ژ١٢، ل٢"دا.

محمود)ی لیٚ هەڵکۆڵراوە[7]؛ بەڵام لە دواداوابیەکانی هەمان مانگدا (١٩٢٢) خۆیی کردە (مەلیکی کوردستان)، ئەم ناسناوە تا ڕووخانی سێیەم حکوومەت [8] و، ئەوەبەدوایش لە دەرەوەی شار هەر مایەوە[9].

### ١. ٢. قەڵەمڕەو:

ئەگەرچی حکوومەتی کوردستان، وەك بە ناوەکەیو هەندێ ڕاگەیاندنی شێخی گەورەدا دیارە، ڕەنگە خۆی بە حکوومەتی هەموو پارچەکان، یا هیچ نەبێ، بە کاکڵەی حکوومەتی سەرتاسەری کوردستان زانیبێ؛ کەچی لە هەرسێ دەورەکەیدا نەك هەر کوردستانی جنووبی، کوردستانی عیراقی ئەمڕۆ، بەڵکە ئەو ناوچانەیشی لێ نەگرتەوە کە بۆی دیاری کرابوون، بە ڕەچاوکردنی کۆمەڵێك هۆ، بۆی هەڵنەکەوت ئەو ئاواتە بهێنێتەدی.

---

[7] بڕوانە وێنەکەی لە: عبدالرقیب یوسف، لە کەلەپووری بەڵگەنامەیی کوردی، "ڕۆشنبیری نوێ" (گۆڤار)، بەغدا، ژ١١٠، حوزەیرانی ١٩٨٦، ل٤٨-٧٧؛ هەمان ئیرادەنامەی نمرە (١٧٠)ی (٨ی جیمادیل ئەووەلی ١٣٣٧)ی حوکمداری کوردستان.

[8] بەڵگەی بەردەست (ئیعلانی ڕەسمی)یە کە مەلیکی کوردستان مەحموود ڕۆژی ١٩٢٢/١٠/٢٩ نووسیویە ("بانگی کوردستان"، ژ١٣، ل٣).

هەروەها بڕوانە: ڕۆژی کوردستان، ژ٣، ٦ کانون اول ١٣٣٨، ل٤؛ ژ٧، ٣٠ کانون اول ١٣٣٨، ل١؛ ژ٨، ١٠ کانون ثانی ١٣٣٨، ل٤؛ ژ١١، ٣ شباط ١٣٣٨، ل٤؛ ژ١٢، ل٣؛ ئومێدی ئیستیقلال، ژ١، ٢٠ ایلول ٣٣٩، ل٣؛ ژ٢، ٢٧ ایلول ٣٣٩، ل١؛ ژ٤، ١١ تشرینی اول ٣٣٩، ل٤.

[9] احمد خواجە، چیم دی، ب٢، سلێمانی، ١٩٦٩, ل١١١، ١٢٩، ١٣٦، ١٤٦.

١. ٢. ١. له یەکەم دەوراندا:

مێجەر نۆئێل کە یەکەمجار هاتە سلێمانی، بە ئاشکرا ڕایگەیاند: شێخ مەحموود حوکمداری هەرێمی نێوان ڕووباری سیروان و زێی گەورەیە. ئەم پێوشوێنە، بە قسەی ویلسنی بریکاری حاکمی سیاسیی بریتانیا لە عیراق، کاتی و لە هەر وەختێکدا بوایە شیاوی چاوپێداخشاندنەوە بوو[١٠].

هەرێمەکە، ڕاست لیواکانی سلێمانی و کەرکووک و هەولێری ئەگرتەوە؛ واتە قەزاکانی پشدەرو شارباژێڕو هەڵەبجەو ناوەندی سلێمانی، چەمچەماڵ و کفری و تووزخورماتوو و ناوەندی کەرکووک، مەخموورو کۆیەو ڕانیەو شەقڵاوەو ڕەواندزو زێبارو ناوەندی هەولێرو ناحیەی نێروە ڕێکانی قەزای ئامێدیی لیوای مووسڵ. ئەوە سنوورەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای بوون. لای باکووری، بێگومان هەر بە سەرووی هەمان ئەو ناوچانەی پێشووی ویلایەتی مووسڵ دوایی هاتووە. سنووری لای باشووریشی، کەموزۆر لە کفریی تێنەپەڕاندووە.

بەوپێیە، قەزاکانی خانەقین و مەندەلی و بەدرە دەرهاوێژرابوون. قەزای زێبارو ناحیەی نێروە ڕێکان و هەردوو ناحیەی برادۆست و مێرگەسووری سەر بە قەزای ڕەواندز نەبن کە ئەو بڕیارە گرتوونیەوەو بەشێکی ناوچەی بادینان پێک ئەهێنن و خەڵکەکەیان بە کرمانجیی باکوور ئەدوێن، ئەوانی تر تێکڕا بریتین لە ناوچەی سۆرانی کوردستانی جنووبی.

---

[١٠] ارنلد تی.ویلسون، بلاد ما بین النهرین بین ولاءین، ترجمة فؤاد جمیل، ط١، ج٣، بغداد، ١٩٩٢، ص١٤-١٥.

دیاریکردنەکەی ویلسن گشتییە، ناوچەکانی بە وردی و سنووریانەوە دەست نیشان نەکردووە. بۆیە هیچ دوورنییە ئەو بەشە بچووکەی بادینان مەبەست نەبووبێ، هەروایش دەرچوو. ئەم لێکجیاکردنەوەیەی ناوچەکانی سۆران و بادینان، یەکەم هەوڵی بەکردەوە دابەشکردن و لێکترازاندنی پارچەی باشوورە، تەماشانەکردنیەتی وەك یەك پارچەی لێکدانەبڕاوی هاوچارەنووس. دواتر کە حکوومەتی پاشایەتیی عیراقیش دامەزرا، پێڕەوی هەمان ڕێوشوێنی کرد، جیاکردنەوەکەی کردە بارێکی واقیعی و بەردەوام.

دەسەڵاتی یەکەم حکوومەتی کوردستان، وەك ڕوون بووەتەوە، بەگشتی هەر لە ناوەندی سلێمانی و قەزاکانی ڕانیەو شارباژێڕو چەمچەماڵ و هەڵەبجەو ناوچەکانی قەرەداغ و سەنگاودا قەتیس بوو. ئەم دەورە، شارباژێڕ تاسەر شێخ محەمەد غەریبی زاوای شێخ قایمقامی بوو[11]. هەڵەبجە، حامید بەگی مەجید بەگی جافی کردبووە قایمقامی[12]. ڕانیە، شێخ ئەمینی سەندۆلانی خزمی شێخی وەك قایمقام خرایە سەر[13]. ناوەندی سلێمانی، سەید عومەری مامی شێخ بوو بە موتەسەڕیفی[14].

---

[11] سي.جي. ادموندز، كرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد، ١٩٧١، ص٩٧.

[12] بلاد ما بين نهرين بين ولاءين، ج٢، ص٣٧؛ م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب١، لەندەن، ١٩٩٠، ل٤٧٠.

[13] ڕفیق حیلمی، یاداشت، چ٢، بەشی یەکەم/ ب١، هەولێر، ١٩٨٨، ل٩٥، ١٠٠؛ دبليو. آر. هي، سنتان في كردستان، ترجمة فؤاد جميل، ج١، بغداد، ١٩٧٣، ص١٧٣، ١٧٧.

[14] یادداشت، ب١، ل٦٢.

خێڵاتــی دەســترۆی شــێخ بزەینـــی و هەمەوەنــدو جــەباری لــە قــەزای چەمچەماڵ، بە ناحیەکانی سەنگاوو قەڵاسێوکەو بازیان و ئاغجەلەرەوە، بوونە لایەنگرو هاوکاری شێخ[15].

قەڵادزێ، بابەکر ئاغای پشدەری لەسەرەتاوە خۆیی کردە حاکمی؛ وەك دەســەڵاتدارانی ئینگلیــز دانیــان پێــدا نــا، شــێخیش وای کــرد[16]. بــەڵام ناوچەکە هەر نەبوە بەشێکی ئەو حکوومەتە. کۆیە، لەهەورەڵەوە هـای یاریدەدەری حاکمی سیاسیی بـوو؛ دوای شوباتی ۱۹۱۹ کاپتن بێڵ تا ئایاری ۱۹۱۹، ئـەمجا ڕانـدڵ بـەو وەزیفەیـە جێـی گرتـەوە[17]. ڕەشـید ئەفەنـدی‌ی ئەفـسەرو مەفرەزەیــەکی عەســکەری کوردســتان، شــەوی ۱۹۱۸/۱۲/۱٦ گەیشتنە ناو کۆیە، تا شێخ عوسمان بە قایمقامی ئەو قەزایە دابنێن. هـای، کردیـە متمانـەپێکراوی تایبـەتی شێخ[18]. ڕۆژی ۱۹۱۸/۱۲/۲۱ حەماغای گەورە بە حاکمی شارو جەمیل ئاغای حەوێزیش بـە جێگـری دەســت نیـشان کــرا[19]. هاوکـات ڕانیــەو کۆیــە، لــەڕووی ئیدارییەوە، خرانە سەر کۆیە. کۆیەیش تا ئەوکاتە، لە ڕێگەی حاکمی سیاسییەوە، بە لیوای سلێمانی‌یەوە بەسترابوو[20].

---

[15] کرد وترك وعرب، ص٤١، ٤٢، ٤٣.

[16] سنتان في کردستان، ج١، ص١٧٣، ١٧٧.

[17] هەمان سەرچاوە، ل٢٢٦.

[18] هەمان سەرچاوە، ل١٦٧.

[19] هەمان سەرچاوە، ل١٧١

[20] هەمان سەرچاوە، ل١٧٢، ٢١٩.

ڕواندن، دوادواییەکانی کانوونی یەکەمی ١٩١٨، یەکەم یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ئینگلیزی بۆ دانرا. کاپتن کێرك کە تەممووزی ١٩١٩ لەوێ دامەزرا، چوارەمین یاریدەدەریان بوو[٢١]. هەولێر، نەخرایە ناو حوکمداریەکەی شێخ؛ تا تشرینی یەکەمی ١٩١٩ بەشێکی لیوای مووسڵ بوو، ١٩١٩/١١/١ ئەمجا کرایە لیوایەکی سەربەخۆ، قەزاکانی کۆیەو ڕواندزیشی پێوە بەستران[٢٢].

شێخ، وەك مێجەر سۆن لە ڕاپۆرتی ساڵانەی ساڵی ١٩١٩یدا نواندوویە، ئەیویست قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی لە خانەقینەوە تا ناوچەی شەمزینان، لە چیای حەمرینەوە تا سنووری ئێران بێ. گەورەترین دەسەڵاتی شێخ لە شوباتی ١٩١٩دا بوو کە کفریو کەرکووکیشی تێدا گرتەوە، لە ڕواندزیش واوەتر چوو[٢٣].

ئەگەرچی شێخ، بە قسەی نۆئێل، بەوپێیە ئەجوولایەوە کە دەستووری پێدرابوو حوکمی ناوچەکانی نێوان سنووری ئێرانو زێی گەورە بکات[٢٤]، بەڵام کاربەدەستانی ئینگلیز تەماعی نیشتمانیی شێخیان بۆ کۆنترۆڵکردنی هەموو ناوچەکانی کوردستان بۆ قووت نەچوو. مارتی ١٩١٩ نۆئێل لابرا، سۆن بۆ کزکردنی دەستڕۆییو بچووککردنەوەی ناوەندەکانی دەسەڵاتی شێخ، وەك حاکمی سیاسی خرایە شوێنی[٢٥].

---

[٢١] سنتان في كردستان، ج١، ص٢٣٥، ٢٣٦.

[٢٢] هەمان سەرچاوە، ل ٢١٩، ٢٢٣.

[٢٣] م. ر.هاوار، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٤٦، ٤٤٨، ٤٥٠.

[٢٤] هەمان سەرچاوە، ل٤٥٩، ٤٦١، ٤٦٣.

[٢٥] كرد وترك وعرب، ص٣٣.

سـەرەتا كـەركووك لـەو پێكهاتـە ئیدارییە دەرهێنـرا، كرایە لیوایـەكی سەربەخۆ. كفریـی لـە حـوزەیرانی ١٩١٩دا لـێ كرایـەوە[٢٦]. شـێخ ئـەمینی سـندۆڵان نیـسانی ١٩١٩ لـە قایمقـامی‌ی ڕانیـە لابـرا[٢٧]، ڕانیـەو قـەڵادزێ لەوكاتەوە پێكەوە كرانە مەڵبەنـدێكی ئیداری كە ناوەندەكەی ڕانیـە بوو، كاپتن باركەر بە یاریدەدەری حاكمی سیاسیی دانـرا[٢٨]. كاپتن لیزیش، بە داوای بـەگزادەكانی جـاف، بـوو بـە یاریـدەدەری حـاكمی سیاسـی بـۆ بەڕێوەبردنی ناوچەی هەڵەبجە[٢٩]. دەسـەڵاتی شـێخ، سـۆن وتـەنی، دواجار هـەر لـە چوارچێوەی پانتاییـەكی (٦٥٠٠-٧٠٠٠كـم$^{2}$)دای نێـوان زنجیرە شـاخەكان و چـەند دەشـتێكی بـەینی بازیـان و شـارەزورو هەنـدێ شـوێنی ڕانیـەو قەڵادزێـدا، واتـە لـە شـاخەكانی قەرەداغـەوە تـا ناوچـەی ئـاكۆ، مایەوەو گیر بوو[٣٠].

١. ٢. ٢. لە دووەم دەوراندا:

شـێخ كـە دوای ئەسـارەت هێنرایـە بەغـدا، ڕاسـپێردرا، وەك ئەدمۆنـدز نووسـیویە، چـالاكی‌ی سیاسـیی هـەر لـەناو لیـوای سلێمانیدا بهێڵێتـەوە.

---

[٢٦] م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٥٠، ٤٦٣.

[٢٧] یادداشت، بەشی یەكەم /ب٢، ل١٠٥.

[٢٨] سنتان في كردستان، ج١، ص٢٢٦.

[٢٩] م. ر. هاوار، هـەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٤٤؛ بلاد ما بين النهرين بين ولاءين، ج٣، ص٢٤.

[٣٠] م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٥٠.

هاوکات لێی ویسترا بۆ نەهێشتنی مەترسیی تورك بەکاربهێنرێ، بەرامبەر بەوەیش داواکانی کە هەموو کوردی هەرسێ لیواکە پشتگیریی ئەکەن، جێبەجێ بکرێن[31]. بەڵام شێخ خۆی، وەك دواتر بە نوێنەری ئووزدەمیری وتووە، گفتی ئینگلیز ئەوە بووە: ئەگەر داوا لە تورکەکان بکات ڕەواندز چۆڵ بکەن، یا خۆیان بۆی چۆڵ بکەن، ئەوا کەرکووك و هەولێر هەتا ئاکرێ و گشت شوێنە کوردنشینەکانی ویلایەتی مووسڵی بۆ ئەخەنە سەر کوردستان[32]. ڕیاسەتی ئەمنییەتی عومووميش، ئەودەمە لە ڕاگەیاندنێکدا بڵاوی کردوەتەوە کە تەشکیلاتی ڕیاسەتەکانی ئێستا کاتییە، مەندووبی سامی بەڵێنی داوە لیواو قەزاکانی کوردستان بخرێنە سەر ئەم حکوومەتە؛ ئەوسا تەشکیلاتی هەمیشەیی بۆ سلێمانیو کەرکووك و هەولێرو زاخۆو ئاکرێو ئامێدیو دهۆك و کفریو خانەقینو ناوچەکانی تری کوردستان پێك ئەهێنرێ[33].

شێخ هەر کە لەکفرییەوە بەڕێوە بوو بۆ سلێمانی، ژمارەیەکی زۆر سەرخێڵو گەورەپیاوی کورد مەزبەتەیەکیان وەك بەڵگەنامە بۆ ئیمزا کرد، بۆ داواکردنی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بە سەرۆکایەتیی خۆی٣٤. دوای ئەوەی کابینەی (حکوومەتی کوردستان)یشی پێك هێنا، ئیدارەی حکوومەتی بردە قەزاو ناحیەکان. ئاڵای کوردستان کانوونی یەکەمی

---

[31] کرد وترك وعرب، ص٢٧٢، ٢٧٤.

[32] یادداشت، ج٢، بەشی دووەم/ ب٦، هەولێر، ١٩٨٨، ل٧١.

[33] بانگی کوردستان، ژ١٣، ل٢-٣.

[34] کرد وترك وعرب، ص٢٧٢.

١٩٢٢ لە هەڵەبجە٣٥، ناوەندی هەمان مانگ لە چەمچەماڵ٣٦ و ١٩٢٣/١/١٤ لە ڕانیە٣٧ هەڵکرا.

هێزەکانی جووڵانەوەی ڕەواندز سەرەتای کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ ڕانیەیان چۆڵ کرد، بەڕێگەی بێتواتەدا کشانەوە بۆ ڕەواندز[٣٨]. بۆیە سەید عەبدوڵڵای حاجی سەید حەسەن کرایە قایمقامی ئەوێ[٣٩]. مستەفا بەگی عەبدوڵڵا پاشای وەسمان پاشای جاف بە بەڕێوەبەری فەوقەلعادەی ناحیەی پێنجوێن دانرا[٤٠]. لە هەڵەبجەیش، ئەحمەد موختار بەگی جاف ئەم دەورە قایمقام بوو[٤١]. وەك ڕەواندزو پشدەر بەدەست جووڵانەوەی ڕەواندزەوە بوون، کۆیە دیسان هیچ پەیوەندییەکی بەم حکوومەتەوە نەبوو، جەمیل ئاغای حەوێزی قایمقامی بوو[٤٢].

ئەگەرچی حکوومەتانی بریتانیاو عیراق، ٢١ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ لە بەیاننامەیەکی هاوبەشدا ڕایانگەیاند: ڕازین کورد لە چوارچێوەی

---

[٣٥] بانگی کوردستان، ژ١٣، ل٦" ڕۆژی کوردستان، ژ٤، ١٣٣٨/١٢/١٣، ل٣.

[٣٦] ڕۆژی کوردستان، ژ٥، ٢٠ کانون اول ١٣٣٨، ل٤.

[٣٧] هەمان سەرچاوە، ژ٧، ل٤؛ کرد وترك وعرب، ص٢٨٣؛ د.ولید حمدي، الکرد و کردستان في الوثائق البریطانیة، لندن، ١٩٩١، ص١٦١.

[٣٨] کرد وترك وعرب، ص٢٧٩.

[٣٩] جەلال تەقی، بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودو سمکۆ، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٦٧.

[٤٠] بانگی کوردستان، ژ١٢، ل٢.

[٤١] ڕۆژی کوردستان، ژ١٤، ٢٤ شباط ١٣٣٨، ل٣.

[٤٢] کرد وترك وعرب، ص٢٧٩.

عیراقدا حکوومـەتێکی ناوچەیی‌ی خۆی هـەبێ[٤٣]، بـەڵام لەڕاسـتیدا هـیچ هەنگاوێکیان بۆ بەدیهێنانی ئەو حکوومەتە نەنا.

بـەم شـێوەیە، ئـەم دەورەیـەیش، سـەرباری هەوڵـدانی شـێخ بـۆ فراوانکردنی قەڵەمڕەوی حکوومەتەکەی تا ناوچەکانی کەرکووك، کەچی دەسـەڵاتی هـەر لـە ناوەنـدی سـلێمانی‌و سەنگاوو قـەرەداغ‌و قـەزاکانی هەڵەبجەو چەمچەماڵ‌و ڕانیەدا مایەوە.

### ١. ٢. ٣. لە سێیەم دەوراندا:

ئـەم حکوومەتـە، لەچـاو هـی دوو دەورانـی پێـشوودا، پانتاییـەکی زۆر تەسـکتر و بچووکتری بەدەسـتەوە بـوو، چـونکە زۆری قـەزاو ناحیـەکانی لێ کرایـەوەو ڕێـی نـەدرا پـەلیان بۆ بهاوێژێ. کاربەدەستانی ئینگلیز، هەر لـە تـەمووزی ١٩٢٣بـەدواوە کـە شێخ کەوتـە پێکهێنـانی تەشـکیلاتێکی نـوێی حکوومەت، ڕێوشوێنیان دانا بۆ جیاکردنـەوەی قەزاکانی ڕانیـەو قەڵادزێو چەمـچەماڵ‌و هەڵەبجـەو (قـەرەداغ‌و سـەنگاو)و ناحیـەی مـاوەت‌و دێهـاتی ساداتی سەرگەڵوو، بە ڕاستیش لێی قەدەغە کران[٤٤].

بەڵام شێخ تێکۆشا مل بۆ ئەو بڕیارە کەچ نەکات؛ ئەوە بوو ١٩٢٣/٨/١٥ ڕایگەیاند تۆفیق جەلالی بە بەڕێوەبەری ناحیەی وارماوا، حەسەن بـەگی عـەلی بەگی وەسمان پاشای بە وەکیلی سەرۆکی هۆزی جاف داناوە[٤٥]. هـەتا شێخ

[٤٣] هەمان سەرچاوە، ل٢٨١.

[٤٤] د. ولید حمدي، الکرد وکردستان في الوثائق البریطانیة، ص١٧٦.

[٤٥] هەمان سەرچاوە، ل١٧٨-١٧٩.

محەمەد غەریبی جێگریشی، کە ڕۆژی دوایی چووە ناو هەڵەبجە بۆ دامەزراندنی ئیدارەی حکوومەت، گەڕایەوە. بەڵام ئینگلیز وارماوای بەستەوە بە کفرییەوە[٤٦]؛ مارتی ١٩٢٤یش، پۆلیس و مەئمووری مەدەنیی ناردە هەڵەبجە، بۆی سەر نەچوو، چونکە شێخ وارماواو خورماڵی گرت. بەوپێیە، قەزای هەڵەبجە بەدرێژاییی ئەم دەورە دەسەڵاتێکی بەردەوامی نە شێخ و نە ئینگلیزی بەسەرەوە نەبوو. سەنگاویش حاڵەتێکی لەو شێوەیەی هەبوو.

ئەوی زانراوە، ئەوڕەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا سەرەتای ئەم حکوومەتە تا ئەیلوولی ١٩٢٣ قایمقامی شارباژێر[٤٧]، سەید محەمەدی شێخ مستەفای موفتیش، حاکمی ناحیەی پێنجوێن[٤٨] بوو. ئەم حکوومەتەیش، بەگشتی، هەر حوکمی ناوەندی سلێمانی و قەرەداغ و پێنجوێن و قەزای شارباژێڕی، بەبێ ناحیەی ماوەت، کرد.

---

[٤٦] کرد وترك وعرب، ص٣١٣.

[٤٧] ئومێدی ئیستیقلال، ژ٢، ٢٧ ایلول ٣٣٩، ل٢.

[٤٨] ئەم ناوە لە دووەم تۆماری خەرجی و داهاتی شارەوانیی سلێمانیی سەردەمی سێیەم حکوومەتی کوردستاندا هاتووە، بڕوانە: عبدالرقیب یوسف، لە بەڵگەنامەکانی حکوومەتی شێخ مەحموود- تۆمارێکی شارەوانیی سلێمانی، لێکۆڵینەوەی سدیق ساڵح، بنکەی ژین- سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٣٢.

## ٢. پێشینەو مێژوو؛

### ٢. ١. یەکەم حکوومەتی کوردستان (١٩١٨/١١/١٧—١٩١٩/٦/١٨)؛

#### ٢. ١. ١. دوادواییەکانی یەکەم جەنگی جیهانی؛

ڕەفیـق حیلمـی، وەك شـایەتحاڵێکی ئـەو ڕۆژگـارە، وردەکاریـەکانی کۆتاییی ئەو جەنگەی لە کوردستانی جنووبیدا وا هێناوەتەوە:

(( لــەم دەورەدا لــەڕووی خراپـــەو زوڵـــم و کـــردەوەی نـــاڕەوای کاربەدەســتەکانی حکوومــەتی عوثمــانی، وە ناڕاســتی و ناپـاکی بەشــی زوربەی مأمورەکانی عەسکەری و مەدەنییەوە خەڵق بەجارێ روویان لە حکوومــەت وەرگێڕابــوو. جگــە لەمــەش بــەناوی (إعاشــە)ی لەشــکرەوە هەرچی خواردەمەنی و ئازووقەی فەقیرو هەژار هەبوو- بەتایبەتی هی دێهـاتی و لادێیـە بەســەزمانەکان بـەبێ دوایـیهـاتـن وە هـەر ڕۆژە بـە ناوێکـەوە، واتـە جـارێ بـە نـاوی (مبایعـە)و گاهێـك بـە نـاوی (إعانـە)وە زەوت و تالأن ئەکرا. بەشی زۆری ئەمانە ئەدزراو لەناو کاربەدەس و گەورە بـێمرووەت و ناپاکەکانـدا بـەش ئـەکراو بەشێکی زۆر کـەمی ئەگەیشتە عەمارەکانی میری کە ئەدرا بە عەسکەرەکانی لەشکر وەیا بە ژن و ماڵ و منالی مأمورەکان و ئەو زابتانە، کە خۆیان لە سنوورەکاندا سنگیان ئەنا بە گوللەوە. دیارە ئەمەش کەڵکێکی ئەوتۆی نەئەگرت و چە ئەهالی و چە عەسکەرەکانی لەشکر ڕۆژبەڕۆژ ئەکەوتنە حاڵێکی خراپترەوەو برسیترو رووت و قــووتتـر ئـەبوون و ئینـسانی زۆر دڵڕەقـیش بــەزەیی پێیـان ئەهاتەوە.

قینی تەبیعەتیش بوو بە سەربار" لەم ساڵەدا کە بەهۆی شەڕەوە چاندنی تۆوی دەغڵودان، و کاروباری فەلاحەتو جووتیاری بەدەس پروپیرێژنو پیرەمێردە بێهێزەکانەوە مابوو، بارانیش چوە بەست وە هەروەکو خەڵقەکە بە چاوپێکەوتنی یەکلەسەریەکی دەردو بەلا ڕاهاتبوونو دڵیان رەق بووبوو، دڵی رەقی تەبیعەتیش نەئەهاتە جۆش وە هیچ نەبێ بۆ رزگارۆکردنی هەژارە بێتاوانەکان لە برسیەتیو نەخۆشی، فرمێسکێکی نەئەرژاند. بە ڕادەیێك کەوا ئەهات بەبیرا ئەم کەونە دڵۆپە ئاوێکی تیا نەبێ.

بەم رەنگە بێرەحمیو بەزەیی پیانەهاتنەوەی تەبیەعت بە فەقیرو هەژارا لەلایەك، و ناپاکیو زەبروزەنگی کاربەدەستە خوانەناسەکان لەلایەکی ترەوە بوون بەهۆی قاتوقڕییەکی بێدادو ماڵ وێرانکەر. بەجوورێك کە هۆقەیەك ئاردی تێکەڵو پڕ لە خاكوخۆڵ چوە لیرەیەك. بە قەدرایی چەن مانگێك بێجگە لە ئەوانەی کە دەوڵەمەندو دەسەڵاتدار بوون وەیا لە حکوومەت مەواجبو ئازووقەیان وەرئەگرت ئەو دوای ئەهالی کەوتنە سەغڵەتیو تەنگانەییێکی وا کە ئیتر مەپرسە. بۆ خواردن، ئاردە برنج، مێوژی رەش، تووی ووشك تەواو بوو و دەس نەئەکەوت.

ئینجا کەوتنە ئاردی بەڕوو خواردن. پەمووودانەش، بوو بە خواردنی دەوری هەرە نەگبەتیو لێقەوماوی فەقیرو هەژاری لوای سلێمانی. دیارە کە ئەم حاڵە بوو بەهۆی داهاتنی گەڵێ جوورە نەخۆشی. لەماتێکا کە خواردەمەنی بەڵکو هەتا نانی ووشكو پاقلەی کولاویش بووبوو بە دەرمانو تەنیا خواپێداوەکان- ئەویش بە دەگمەن- دەسیان ئەکەوت،

دەرمان، دەسیش بکەوتایە لەوانە نەبوو بێتەوە بەبیرا وەیا چواری وا هەبوو کە بتوانێ بیکرێت.

لەبەر ئەمە هەموو نەخۆشێك ئامزەدی مردن بوو. خۆزگە زووش ئەمردن وە پێش ئەوەی کە بېن بە مەینەتی دونیا، لەبەر چاو پاك ئەبوونەوە. بەڵام ئەم نەخۆشانە کە بەشی زۆربەیان هیچ دەردێکیان نەبوو" لەرووی خواردنی خراپ و نەرمەی تۆپیوی هەندێ باڵندەو مریشك و کەڵەشێر وەیا لەبەر خواردنی ئاردە بەروو، یان تووی ووشك و پەموودانە، پێش مردنیان بە ماوەیێکی تەواو رەق و ووشك ئەبوونەوە، ئینجا دەموچاوو دەس و پێیان ئەئاوصا، وە قژی سەرو ریش و سمێڵی چڵکن و ئاڵۆزاوی بەیەکاچویان بە رووی ئاوصاوو چاوی بەقوولاچویانا ئەهاتە خوارەوە. نەك نێرینە بەڵکو ژنە کەساسەکان و کچە جوانکیلەکانیش کە رووت و قووت مابونەوە لەشیان بۆ دانەئەپۆشراو بەتەنگ شەرمەوە نەمابون. ئینجا سەرەتای زستان دەرکەوت بەڵام زستانێکی سەخت و بەپێچەوانەی فەصڵی دەغڵ‌ودان زستانێکی ئێجگار ساردو سۆڵەو بەباران. ئیتر ئەوانەی کە خوا پارویێك نانیشی‌دابوونێ و بە کولەمەرگی سکیان تێر ئەکرد لەبەر هاوارو نووزەی بێ‌هێزو دەنگی پاڕانەوەی ژن و منداڵ و پیرەمێردە نەخۆشەکانی دەس‌وپێ ئاوصاو، کە لەژێر باران و رەشەباو سەرمای زەمهەریری شەوانی زستانا لە کۆڵانەکانەوە ئەهاتە بەر گوێ، ئارامی لێ ئەبڕاو بەبێ دەسەڵات دەسی ئەکرد بە گریان. بەمەش هەر شوکر. بەڵام رۆژ نەبوو کە شارێکی وەکو سلێمانی، لە برسا وەیا لەبەر نەخۆشی کە ئەویش هەر لەرووی

برسیەتیەوە بوو لە دە کەس کەمتری لێ بمرێت. ئەم ژمارەیە بەلای کەمەوەیە ئەگینا گەڵێ ڕۆژی وا ئەبوو کە زیاتریشی لێ بمرێت. ئیتر شاردنەوەی نەرمەی مردوەکان لە تەواناى بەلەدیەدا نەما. بە تایبەتی دووای ئەوە کە لەبەر زۆری تێپەڕبوونی نەرمەی مردوو بە کۆڵانەکاندا زراوو زەنــدەقی زنـــدووەکان چـــوو، ئینجـــا کـــاتی بەلادانەچـــوون و نەشاردنەوەی نەرمەی مردوەکان دەسی پێکرد. ئیتر پیاوم نەویست کە ڕوو بکاتە مزگەوتە ڕووخاوێك، بە چەپەرو لاکۆڵانێکدا تێپەڕێت، وەیا سەربکا بە کەلاوەییێکا وەیا چاو بە ژوورێکی چۆڵو تاریكو بۆگەنا بگێڕێت. بێگومان لە هەموو هەنگاوێکدا نەرمەییێکی ڕووت و قووت و ئەصاوو شینهەڵگەڕاوی بەرچاو ئەکەوت کە بەنیادەمی ئەترساندو ئەیسڵەماندەوە.

چاونووقاندن و ڕاکردن لەم دیمەنە خەفەتپژێنەرانە کەڵکی نەئەگرت، بە خۆشاردنەوەو دوورکەوتنەوە ڕزگاری لەم وێنە پڕ لە عیبرەتانە، کە کزەی لە جەرگ ئەهێناو دڵی هەڵئەقرچاند، چنگ نەئەکەوت. ڕەوشت و خووی بەرز نەوی بووبوو، دڵسۆزیو داوێن پاکی لە بەشی زۆری خەڵق هەڵگیرابوو. بەکورتی سروشتی پاك لە قامووسی بەشەرا نەمابوو و سڕرابوەوە. داوێـــن پیـــسی و کەمتەرخـەمی لـە ناموســدا، گەیـشتبوە ڕادەییێکی وا قەت نەیبینی. هەر لەم دەورەدا لە ئێرانیشەوە پۆل پۆل خەڵق بە سواڵ کردن و هەلاتوویی خۆیان ئەگەیاندە سلێمانی و لەمانە بەشێکیان بە فرۆتنی لەشیان ئەچوون بەڕێوەو تا ماوەییێکی تریش بە کولەمەرگی ژیانلە خەڵقی شارەکەش ئەوانەی کە دەوڵەمەند نەبوون وەیا

هـۆی ژیانیـان بەدەسـەوە نـەبوو، وەیـا لەوانـە نـەبوون کـە بێنـە بـازاڕی بێشـەرمی و کاسـبی بەلەشـیانەوە بکـەن وردە وردە بـە وێنـەیێکی وا جگەربڕ توانـەوەو بە نـاخی عـەرزا چوونە خـوارەوە کە هەرگیزاوهـەرگیز لـەبیر نەچێتەوە))[49]. سلێمانی هـەر سێیەکی ژمارەی دانیشتوانی پێش جەنگی تێدا بە زیندوویی مابوەوە[50].

دوای ئـــەوەی هێزەکـــانی ئینگلیـــز ڕۆژی ١٩١٨/٥/٧ شـــاری (کـەرکووك)یـان گـرت، سـوپای عوسمـانی لـە سـلێمانی کـشایەوە. سەرخێڵان و گەورەپیاوانی کورد کۆبوونەوەو بڕیاریان دا (حکوومـەتێکی کـوردیی کـاتی) بـە سـەرۆکایەتیی شـێخ مـەحموود پێك بهێـنن، وا کـە لایـەنگری بریتانیـا بـێ. شـێخ نامـەی بـە نـاوی ئـەو حکوومەتـەوە بـۆ کاربەدەستانی ئینگلیز نارد، بە هـۆی عەبدوڵڵا صافیی یەعقووبییـەوە بۆ جەنەڕاڵ مارشاڵی فەرماندەی هێزی ئینگلیـز لە کەرکووك. شێخ لـەو نامەیـەدا وەك نوێنـەری نـەك هــەر کوردسـتانی جنـووبی، بەڵکـە هــی ڕۆژهەڵاتیش تا ئەگاتە شاری (سنە) خۆی پێناساندن و داوای لـێ کردن یـا ناوچـەکەیان بداتـە دەسـت یـان خـۆی وەك نوێنـەری ئـەوان حـوکمی بکات؛ بۆی نووسین:

((خـەڵکی کوردسـتان بـە سـەرکەوتنی ئینگلیـز دڵـشادن، چـونکە بـە زەبری هێزەکانی لە ملهوڕی و ستەمی تورك ڕزگار بوون، بـە هیـوان ڕێیـان

---

[49] یادداشت، بەشی یەکەم/ ب١، ل٢٩-٣٣.

[50] دافید کورن، المصدر نفسه/ ٢، "الاتحاد"، العدد ٣٢٤، ١٩٩٩/٦/٢٥؛ المس بیل، المصدر نفسه، ص٢٠٤.

بـدەن لـە سـایەی حـوکمی ئینگلیـزدا ببووژێنـەوەو گەشـە بکـەن)). قسەکانیشی وا بڕییەوە: دەستەبەری ئەوە بکرێ کە نەهێڵرێ جارێکی تـرو لـە هـیچ هەلومەرجێکـدا تـورك بگەڕێتـەوە بـۆ کوردستان. هاوکـات سەرانی هەمەوەندیش بە نامە ئەو کاربەدەستانەیان ئاگادارکردەوە کە بە هاتنیان خۆشحاڵن‌و ئامـادەن بە ئاژاڵ‌و دانەوێڵـە کۆمـەکی سـوپاکەیان بکەن[51].

ئەو هێزانە ڕۆژی (٢٤/٥)، لەبەر گوشاری سوپای تورك‌و هۆی تری لۆجیستی‌و عەسکەری، کتوپڕ (کەرکووك)یان چۆڵکرد. جەنراڵ مارشاڵ بۆ بەرپرسانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیای نووسی: ناتوانێ پارێزگاری لـە شـارەکە بکـات، چـونکە پەلـە کـراوە لـە داگیرکردنـی؛ ئەگـەر تێیـدا بمێننـەوە، ئەنجامەکـەی کارەسـاتبار ئـەبێ بـۆ هێزەکـانی ئینگلیـز. هـەم زەخیرەی تـەواو شـك نەئـەبرا، هـەم کـەموکوڕی لـە هۆیـەکانی گواستنەوەدا هەبوو بۆ پەلاماردانی مووسڵ لە قوڵی کەرکووکەوە[52]. تورکەکان گەڕانـەوە

---

[51] احمد خواجە، چیم دی، ب١، بغداد، ١٩٦٨، ل١٨؛ رفیق حلمی، یادداشت، بەشی یەکەم / ب١، ل٥٤؛ ولید حمدي، الکرد وکردستان في الوثائق البریطانیة، ص٤٤-٤٥؛ سر أرنلد تي. ویلسون، بلاد ما بین النهرین بین ولاءین، ترجمة فؤاد جمیل، ط١، ج٢، بغداد، ١٩٩٢، ص١٧٧، ٣١٩، ٣٢٠؛ المس بیل، فصول من تاریخ العراق القریب، نقله الی العربیة وکتب حواشیه جعفر الخیاط، ط٢، بغداد، ١٩٧١، ص١٥٢.

[52] سر أرنلد تي.ویلسون، المصدر نفسه، ص، ١٧٧، ١٧٨؛ المس بیل، المصدر نفسه، ص١٥٢؛ دافید کورن، رجلان اقحما الاکراد بالعراق: مناورات کوکس-

بۆ سلێمانیو کەرکووك. عەبدوڵڵا صافی مەسەلەی نامەکەی شێخی گەیاندە بەرپرسانی تورك. بۆیە وەك بە مستەفا بەگی قایمقامی عەسکەریی فەرماندەی فەوجەکەی تورك لە سلێمانی وترا، شێخی بە فێڵ دەستگیر کردو ناردیە کەرکووك. لەسەر ئەو کردەوەیە بڕیاری خنکاندنی درا. بەڵام عەلی ئیحسان پاشای فەرماندەی تازەی ئوردووی شەشەمی عوسمانی بانگی کردە مووسڵ؛ لەبەرئەوەی باری تورك لار بوو، شێخیش وەك سەرکردەیەکی دەسترۆ ئەیتوانی لە تەنگانەدا فریایان بکەوێ، لێی خۆش بوو، کردیە سەرلەشکرێکی میللیو بە پێنجسەد لیرەی زێڕەوە ناردیەوە بۆ سلێمانی تا هێزی عەشایەر رێك بخاتو چەكوچۆڵو پێویستیی تر لە سەربازگەکەی سلێمانی وەربگرێ[٥٣].

هێزەکانی ئینگلیز (١٩١٨/١٠/٢٥) شاری (کەرکووك)یان گرتەوە[٥٤]. ڕۆژی ٣١ی ئەو مانگەیش، بە مۆرکردنی ئاگربەستی مۆدرۆس، یەکەمین جەنگی جیهانی بڕایەوە. عەلی ئیحسان پاشا بە تەلگراف فەرمانی بە عەلی ڕەزا بەگی موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی دا ئیدارەی شار بداتە دەست شێخ مەحموود، ناسناوی (نەقیب) یشی بۆ وەرگرت. هەر فەوجە عەسکەرەکەی تورك بە فەرماندەیی سالح بەگی تابوورئاغاسی مایەوە[٥٥].

---

ویلسون /١، ترجمة د. حميد عبدالملك، "الاتحاد" (جريدة)، السليمانية، العدد ٣٢٣، ١٩٩٩/٦/١٨.

[٥٣] چیم دی، ب١، ل١٩؛ یادداشت/ ب١، ل٥٣، ٥٤.

[٥٤] وليد حمدي، المصدرنفسه، ص٤٦؛ المس بيل، المصدر نفسه، ص١٥٣.

[٥٥] یادداشت، ب١، ل٥٦-٥٧.

بە داگیرکرانی (مووسڵ)یش لە (١٩١٨/١١/١٠)دا، سەرتاسەری کوردستانی جنووبی بەکردەوە کەوتە ژێر ڕکێفی هێزەکانی ئینگلیز[٥٦].

بریتانیاو فەرەنسە هەر ئەو ماوەیە، وردتر ١٩١٨/١١/٨، لە بەیاننامەیەکدا ڕایانگەیاند: ((مەبەستی فەرەنسەو ئینگلتەرە لە چوونە مەیدانی جەنگ لە ڕۆژهەڵاتدا، ئەو جەنگەی کە تەماعەکانی ئەڵمانیا هەڵی گیرساند، ڕزگاریی تەواوو یەکجاریی ئەو گەلانە بوو کە ساڵەهایە لەژێر نیری چەوسانەوەی تورکدا ئەناڵێنن، دامەزراندنی حکوومەتی نیشتمانیو ئیدارەی مەدەنیشە بۆیان کە دەسەڵاتەکەی لە ئیرادەی دانیشتوانی ڕەسەنو هەڵبژاردنی ئازادانەی خۆیانەوە وەرگرتبێ. هەریەکە لە فەرەنسەو ئینگلتەرە جەخت لەسەر پشتگیریی ئەو مەبەستە ئەکەنو هاوکاری دامەزراندنی ئەو حکوومەتو ئیدارانەی نیشتمانین لە سووریاو هەرسێ ویلایەتی میزۆپۆتامیا، کە ئەو ناوچانەن وا هاوپەیمانان ڕزگاریان کردن، بەو ناوچانەیشەوە کە هێشتا لە هەوڵی ڕزگارکردنیاندان؛ سوورن لەسەر یاریدەدانی ئەم ئیدارانەو دان پێدانانیان کاتێك بەتەواوی دائەمەزرێن. فەرەنسەو ئینگلتەرە نیازێکی ئەوتۆیان نییە خەڵکی ئەم هەرێمانە ملکەچی هیچ جۆرە حوکمێك بکەن، بەدەر لەوەی کە خۆیان هەڵی ئەبژێرن. بەڵام هەردوکیان یەك ئامانجیان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە گەشەپێدانی کاری ئەم حکوومەتو ئیدارانەی وا خەڵك بە ئازادی هەڵیان ئەبژێرن، بە سەرپەرشتیو هاوکاریی ئەوان جێبەجێ ببێ. هەردوو دەوڵەتی ناوبراو دادو پاکیو یەکسانی لە مامەڵەدا دەستەبەر ئەکەنو تێ

---

[٥٦] ولید حمدي، المصدر نفسه، ص٤٦؛ المس بیل، المصدر نفسه، ص١٥٣.

ئەكۆشــن كاروبــاری ئــابووری چــاك بكــەن و كەســانی خــاوەن بــەهرەو لێهاتوویی هان بدەن و زانست بڵاو بكەنەوەو ڕق و كینەو ناكۆكیی كۆن كە سیاسەتی تورك لە ناوچەكەدا دروستی كردوون، نەهێڵن. ئەمانە ئەو ئامانجانەن كە هەردوو هاوپەیمان لە وڵاتە ڕزگاركراوەكاندا هەوڵیان بۆ ئەدەن))[٥٧].

شێخ دیسان هەڵی بارودۆخەكەی قۆستەوە، نامەیەكی بە عیززەتی تۆپچی و ئەحمەد فایەقی تاپۆی جووتە نوێنەریدا ناردە كفری لەڕێی موحسین ئاغاوە كە پێشتر پەیوەندیی بە كاربەدەستانی ئینگلیزەوە كردبوو، بە هەمان بۆچوونەكانی پێشوویەوە دڵنیای كردنەوەو داواكار بوو كورد لە لیستی میللەتانی ڕزگاریخواز ناوبوێر نەكەن[٥٨]. مێجەر نۆئێل وەك حاكمی سیاسی ی لیوای كەركووك كە ناوچەی نێوان زێی گەورەو ڕووباری سیروانی ئەگرتەوە، بە یاوەریی ئەو دوو نێردراوەی شێخ، لەڕێگەی كفرییەوە هاتە دێی (داریكەلی). شێخ مەجلیسێكی لەماڵی خۆیدا گرت" لەو پیاوماقووڵە ناسراوانەی شاری گەیاند كە دەستەیەكی ئینگلیز بەڕێوەن بۆ سلێمانی، داوای لێ كردن چەند كەسێك لە خۆیان هەڵبژێرن بۆ بەپیرەوەچوونیان. ئەو كۆمەڵە بە ولاخ ڕوویان كردە داریكەلی. دەستەكەی ئینگلیز هێزێكی چەكداریان لەگەڵدا نەبوو، بۆیە مەترسیی مانەوەی فەوجەكەی توركیان هەبوو، لەپێشدا نەیانویست

---

[٥٧] يقظة الكرد، ص١٣٩؛ دافيد كورن، المصدر نفسه/٢، "الاتحاد"، العدد ٣٢٤، ١٩٩٩/٦/٢٥.

[٥٨] یادداشت، ب١، ل٥٧؛ المس بيل، المصدر نفسه، ص١٨٧.

بێنە ناو شار. بەتەما بوون شێخ لە داریکەلی بیانبینێ. بەڵام کە پێشوازیکەران چوون، دڵنیا بوون[٥٩]. ئەوە بوو پاشنیوەڕۆی (١٩١٨/١١/١٦) بە ڕێنوێنییەکانی بریکاری حاکمی گشتییەوە گەیشتنە سلێمانی، کە ئەمەیە:

((تۆ ئێستا لە ١ی تشرینی دووەم بەدواوە ئەفسەری سیاسیی لیوای کەرکووکی. ئەم لیوایە لەنێوان زێی خواروو و ڕووباری دیالەدایە تا سنووری تورکیا– فارس لەڕۆژهەڵاتەوە، بەشێکی ویلایەتی مووسڵە کە چارەنووسی یەکجارەکیی جێی بایەخی حکوومەتی خاوەن شکۆیە. ئەم هەرێمە حاڵی حازر بە ناوچەیەکی داگیرکراوی عەسکەری دائەنرێ‌و خۆمان بەڕێوەی ئەبەین‌و مامەڵە لەگەڵ سەرانی میللەتی ئەوێدا بەو سیفەتەو بەوپێیەیە. تکام وایە لەبیرت نەچێ کە ڕەنگە ئیدارە هێزی عەسکەری بنێرێ بە شێوەیەکی هەمیشەیی لە سلێمانی مۆڵ بخوات.

لەوانەیە هێز بۆ شوێنی تری ڕۆژهەڵاتی سنووری ئێستایشمان بنێردرێ. ئەبێ بە هاوکاریی سەرانی ناوچەکە ڕێ‌وشوێنی پێویست دابنێی بۆ پاراستنی ئاسایش‌و نیزام بەتایبەت لە شوێنەکانی دەرەوەی سنووری ناوچە عەسکەریە داگیرکراوەکانی ژێر دەستی ئێمە. هەروەها ئەبێ چالاکیی نۆکەرانی دوژمن نەهێڵی، هێزەکانمان چ ئازووخەیەکیان ئەوێ بۆیان دابین بکەی. سەرپشکم کردووی لەو چوارچێوەیەدا کە بۆم

---

[٥٩] یادداشت، ب١، ل٥٧–٥٨؛ الدكتور احمد عثمان ابوبكر، كردستان في عهد السلام، القسم الثامن عشر، "الثقافة" (مجلة)، بغداد، العددان ١٠–١١، تشرين الاول– تشرين الثاني ١٩٨١، ص٧٠–٧٨.

دیاری کردووی، پارەی پێویست خەرج بکەی. با لای تۆو سەرانی ناوچەکەیش ئاشکرا بێ کە ڕێوشوێنەکانی دایان ئەنێی لەبەر ناچارین، بۆیە کاتیو ناوبەناو دوچاری چاوپێداگێرانەوە ئەبن. سەرپشکم کردووی شێخ مەحموود بە نوێنەری ئێمە لە سلێمانی دابمەزرێنی. بۆیشت هەیە، ئەگەر بە گونجاوت زانی، کەسی تر لە هەریەکە لە چەمچەماڵو هەڵەبجەو شوێنەکانی تر دابمەزرێنی. ئەبێ ئەو سەرۆکانەی کە پەیوەندییان پێوە ئەکەی، بۆیان ڕوون بکەیتەوە کە حکوومەتی خاوەن شکۆ نایەوێ جۆرە ئیدارەیەکیان بەسەردا بسەپێنێ لەگەڵ دابو نەریتو ئارەزوویاندا ناکۆک بێ.

پێویستە لەسەرت هانی سەرۆك هۆزەکان بدەی کۆنفیدراسیۆن پێك بهێنن بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکانیان بە چاودێریو ڕاوێژی ئەفسەرانی سیاسیی بریتانیا. ئەیشبێ باجی یاسایی خۆیان بدەن بەپێی یاساکانی تورکیا. بۆت هەیە لەم مەسەلەیەدا چی بە باش ئەزانی لەبەر ناچاریو هێندەی بەستە بە ئاسایشەوە، بیکەی))[60].

نۆئێل، هەمان ڕۆژ ئەم برووسکەیەی بۆ بەغدا لێ داوە: ((ئەمڕۆ گەیشتمە سلێمانی، وەك مەلیك پێشوازیم لێ کرا. نوێنەرانی دێهات بە درێژاییی ڕێگە ڕاوەستانو نیشانەی خۆشحاڵییان بە بۆنەی هاتنمانەوە پێوە دیار بوو)). هەر لەو یەکەم برووسکەیەشدا نووسیبووی: ((من وای نابینم پاشەڕۆژ کۆسپێکی زۆر بێتە ڕێی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەسایەی ئێمەداو بە کۆنترۆڵی ئەفسەرە سیاسیەکانمان، بە مەرجێك هەر

---

[60] جرجيس فتح الله، يقظة الكرد، ص١٩٩-٢٠٠.

ئێستا ڕێوشوێنی پەلەی بۆ دابنرێ. جووڵانەوەکە هیچ نەبێ لە سلێمانی بەهێزە)). نۆئێل پێبەپێ ڕایسپارد جووڵانەوەیەکی تری هاوشێوە لە چەند ناوچەیەکی کوردنشینی باکووری مووسڵ بخوڵقێنرێ[61].

### ٢. ١. ٢. دەورانی یەکەم حکوومەتی کوردستان:

نۆئێل ڕۆژی دوایی (١٩١٨/١١/١٧) لە کۆبوونەوەی فراوانی بەردەرکی سەرای سلێمانیدا کە عولەماو ئەشراف و سادات و تاجرەکان و خەڵکێکی زۆری شاری و دێهاتی و سەرخێڵان و هێندێ سەرخێڵی کوردی ڕۆژهەڵاتیش بەشداری بوون، وتارێکی درێژی بە فارسی خوێندەوەو ڕایگەیاند: شێخ مەحموود حوکمداری کوردستانە[62]. هەر ئێوارەی ئەو

---

[61] کردستان في عهد السلام، القسم الثاني عشر، "الثقافة"، العددان ١١-١٢، تشرين الثاني- كانون الاول ١٩٨٠، ص٦٨-٧٦.

[62] چیم دی، ب١، ل٢٠-٢١؛ یادداشت، ب١، ل٦٠-٦١؛ سر ارنلد تي. ويلسون، المصدر نفسه، ج٣، بغداد، ١٩٩٢، ص١٤-١٥، ١٧.

شایانی وتنە، کاک کەمال ڕەئووف محەمەد لە وتاری (١٩١٨/١١/١٥ نەك ١٩١٨/١١/١ یەکەم حکوومەتی کوردستان دامەزرا، "کوردستانی نوێ"، ژ١١٦٦، ١٩٩٥/١٢/١٥)دا، (١٩١٨/١١/١٥)ی بە مێژووی دامەزراندنی ئەم حکوومەتە دانابوو. سەرەتای ساڵی ١٩٩٧ ڕاستیی مێژووی (١٩١٨/١١/١٧)م لەلا ساغ بووەوە، بەڵگەی ڕۆژی گەیشتنە سلێمانیی "نۆئێل" (١٩١٨/١١/١٦)م خستە بەردەستی بەڕێزیان، ئەو هەڵەیەی بە وتارێکی تر (یێکەم حکوومەتی کوردستان ١٩١٨/١١/١٧ نەك ١٩١٨/١١/١ دامەزراوە، "کوردستانی نوێ"، ژ١٤٣٤،

ڕۆژە ئەهالی و گەورەپیاوان لە ماڵی شێخ مەحموود کۆکرانەوەو بەیعەت بە حوکمدار کرا. بڕیاریش درا نۆئێل دەست بە ڕێکخستن و یەکخستنی شارەکانی کوردستانی جنووبی بکات. نۆئێل ناوی حاکمی سیاسیی لێ نرا، بینای (مەکتەبی ئەعدادی- دواتر فەیسەڵییە)ی بۆ کرایە بارەگا[٦٣].

ئیتر حوکمدار مانگی ١٥٠٠٠ ڕووپیە مەواجیبی بۆ بڕدرایەوە. تەشکیلاتێکی بەڕێوەبردن، وەك ئەوەی پێشووی لیوا لە سەردەمی عوسمانیدا لە شاردا دامەزرا: سەید عومەری مامی شێخ کرا بە موتەسەڕیف، حاجی سەید حەسەنی مامەکەی تری بە حاکم یا ڕەئیسی شەرع، شێخ قادری حەفید بە سوپاسالار (سەرۆکی هێزی لیڤی)، تایەری محەمەد ئەفەندیی فەرخە بە بەڕێوەبەری پۆلیس و حاجی ئاغاو مستەفا ئاغا بە یاریدەدەری، ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ (حەمدیی ساحێبقران)یش بە سەرۆکی شارەوانی[٦٤]. عارف صائیب کاتبی تایبەتی شێخ بوو. شێخ ڕەئووفی زیاییی سەقزی کە بۆ پیرۆزبایییی دامەزرانی حکوومەتی کوردستان هاتبوە سلێمانی، چەند مانگێك مایەوەو شێخ ڕاوێژی پێ ئەکرد[٦٥]. بەو پێیە ئەم حکوومەتە نە ڕیاسەتەکان و نە ڕۆژنامەیەکی زمانی

---

١٩٩٧/٧/١٠) ڕاست کردەوە، کەچی هیچ ئاماژەیەکی بۆ ئەم ساغکردنەوەیەی من تێدا نەبوو.

[٦٣] یادداشت، بەشی یەکەم/ ب١، ل٦٢.

[٦٤] یادداشت، ب١، ل٦٢؛ چیم دی، ب١، ل٢٧؛ م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٠٨.

[٦٥] شیخ رئوف ضیایی، یادداشتهایی از کردستان- خاطرات شیخ رئوف ضیایی از وقایع حضور روسیه و بریتانیا و عثمانی و آشوبهایی محلی، بە

حاڵی وەك دوو حكوومەتەكەی لەوەبەدوای هەبوون. ئەوە نەبێ كە كوردی هەر لە سەرەتاوە كرایە زمانی ڕەسمیی بەڕێوەبردن.

ئـەو دەورەیــە، ڕەفیــق حیلمــی وتــەنی، ((ســلێمانی خرۆشــابوو. ســوارەیەكی زوربــەی عەشــایەر، لادێییــەكی زۆرو خــەڵقی دەوروپــشت، دێهاتیەكانی شێخ محمود دووابەدواو لـە هـەموو لایەكـەوە روویان كردبوە ئـەم شـارە بـچووكە. كۆلانـەكان، چـایخانەكانو قەیسەرییو بـازاڕ، مـاڵی گـەورەكانی سلێمانیو دەوڵەمەنـدەكان، جمـەی ئـەهات. بـرنجو گـەنمی عـەماری میری كـە لـە توركـەكان مـابوەوە، هـەر زەخیرەیـەك كـە لـە عـەماری دێهاتەكانی شێخ محموددا هەبوو ئەكرا بە پلاوو چێشتو لە چێشتخانەی حوكمدارەوە ئەچوە ورگی ئەم عەشاماتەوە. لەولای تریشەوە مێجەر نۆئێل خەریكی چارەسازی گرانیو برسیەتی بوو، پەیتا پـەیتا لـە عەمارەكانی كركوك، وە لە بەغداوە شـەكرو چاو ئاردی سپی ئەگەیانـدە سلێمانی، وە بە خۆڕایی بەسەر فەقیرو هـەژارو مأمورەكانـدا دابەشی ئەكرد. ئـەم شتانە لەوكاتەدا لە سلێمانی قات بوو و دەس نەئەكەوت. لەبەر ئـەوە هەرچی كـە لـە فـەقیرو هـەژارەكانو مأمورەكـان ئەمایـەوە، بـەهۆی ڕەئیـسی بەلەدیـەی شارەوە ئەیخستە بازاڕەوەو بە نرخێكی كەم ئەفرۆشرا بـەو دوای ئـەهاڵ. بەم تەرحە خەڵقی شارو دێهاتـەكان، فـەقیرو هـەژارو لێقـەوماوەكان كەوتنـە خۆشـیو كـەمێك بووژانـەوە، نۆئێـل هـەر بەمـە نەوێـستا. بـەڵكو روپیـەو بانكنۆتو قەدەرێكی زۆر لیرەی توركی ئاڵتونیشی رژاندە سلێمانیو بەبێ

---

كوشش عمر فاروقى، انتشارات صلاح الدين ايوبى- ارومیـه، ١٣٦٧، ص٨٨- ٩٥.

دەس پێـوە لـەرزین بەسـەر رەئـیس عەشـیرەتەکان و دەسـتەو دائـرەی حوکمـدارا بـڵاوی ئـەکردەوە. ئینجـا مەپرسـە. نۆکـەرو خزمـەتکار، کارەکەران و دایەن، مامان و کەنیزەك سەریان بەرز کردەوەو خۆیان گیڤ کـرد. هەریەکـە بـە ناوێکـەوە مووچەو بەرات و مـەواجبیان بـۆ بڕرایـەوە. نۆکـەر بـە خەنجـەرو دەمانـچەوە، دایـەن و کـەنیزەکان بـە هـاڕەی خـشڵ و هەیاسـەو لاگـیرەی زێڕینـەوە کەوتنـە فـشەفش. شـەڕواڵ و مرادخـانی و چەفتەو مشکی سوورمەو ئاوریشمی دەستەی شێخان و دەس وپێوەند، دیمەنێکی تری دابوو بە سلێمانی.

لەدوای دەوری رووت وقووتی و برسیەتیەکی کوشندە، بووژانەوەیەکی وا کوتووپڕ دیمەنەکانی تێروتەسەلی و جوانی و خۆشبەختی- هەرچەندە بەخیلی پێبردنیشی تیا هەبوو- دیسانەوە جێی سوپاس بوو. چونکە هیچ نەبێ یادی هـەژارە رووت وقووت ووشکهـەلاتوەکان و تەرمە ئاوساوو شینهەڵگەڕاوەکانی مردووی ناو مزگەوت و کەلاوەو لاکۆڵانەکانی دوێنـێی لەبیر ئەبردەوەو هیوای ژیانی تازە ئەکردەوە. بەڵام وەکو کورد ئەڵێت: دەستەو دایەرەی نەفام بەمە بەرەو یاخیبوون ئەڕۆیشتن و لە وزە ئەچوونە دەرەوە))[66].

ویلسن ڕۆژی ١٩١٨/١٢/١ بـە فڕۆکـە هاتـە سـلێمانی، ئامـادەی ئـەو کۆبوونەوەیـە بـوو کـە نۆئێـل پێشوەخت سـازی کـرد، نزیکـەی شەسـت سـەرگەورەی ناوچـەکە بەشـداری بـوون. شـێخ دوای گفتوگۆیـەکی درێژخایەن مەزبەتەیەکی بە ئیمزای چل گەورەپیاو وەك نوێنـەرانی خەڵك دایە دەستی، ئاماژەی تێدا کرابوو بۆ ئەوەی کە بریتانیا نیازیـەتی گەلانی

[66] یادداشت، بەشی یەکەم/ ب١، ل٦٣.

ژێـر چـەپۆکی عوسمـانی ڕزگـار بکـاتو یاریـدەیان بـدات تـا قـەوارەی سـەربەخۆی خۆیـان دروسـت بکـەن. بۆیـە داوای لـێ دەکـەن پارێزگـاریی کـورد بکـات تـا پێشکەوتنی زامـن ئـەبێ. "ویلـسن"یـش لـە پـەیامێکی نووسـراویدا ئاشـکرای کـرد: ڕێ لـە هـیچ هـۆزێکی هـەرێمی نێـوان زێی گەورەو ڕووباری سیروان ناگیرێ بێتە ژێـر ئالأی شێخ مەحموود کە ئەو ناوچـەیە لـەبری حکوومـەتی بریتانیـا بـەڕێوە ئـەباتو پـشتیوانییەکی مەعنەوی ئەکرێ[٦٧].

شێخ پێی وابوو ئینگلیز ڕزگارکەری کوردە لە حوکمی تورك، یاریـدەی ئەدات حکوومەتێکی کوردی پێك بهێنێ لە چیای حەمرینـەوە تا سنووری ئێرانو ناوچەی شەمزینان درێژبێتەوە[٦٨].

نۆئێل کۆتاییی کانوونی یەکەمی ١٩١٨ بە مەبەستی ڕێکخستنەوەی ئیـداریی ناوچـەکانی بـاکوورو بـاکووری ڕۆژئـاوای ئـەو هەرێمـە کـە بـۆی دەسـتنیشان کرابوو، گەشتێکی دەسـت پـێکرد. (١٢/٢٥) لـە کۆیـە بـوو، ٢٧ی ئەو مانگە لەوێوە ڕوویکردە ڕەوانـدز. بـۆی دەرکـەوت هـەموان شێخ مـەحموودیان وەك نوێنـەری خۆیـان قبوولـەو حـەز بـە هاتنـەناو ئـەو فیدراسیۆنە کوردییە ئەکەن[٦٩]. هەر دوای سـێ حەفتەیـەکیش گەڕایـەوە بۆ

---

[٦٧] سـر ارنلـد تـي.ويلـسون، المـصدر نفسه، ج٣، ص١٦-١٧؛ كردستان في عهـد السلام، القسم الاول، "الثقافة"، العدد ٨، آب ١٩٧٩.

[٦٨] م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٤٦.

[٦٩] المـس بيـل، المـصدر نفـسه، ص١٩١؛ دبليـو.آر. هـي، سـنتان في كردسـتان ١٩١٨-١٩٢٠، ج١، ص ١٧٣، ١٧٩؛ سـر ارنلـد تـي. ويلـسون، المـصدر نفـسه، ج٣، ص٢١؛ كردستان في عهد السلام، القسم الاول.

سلێمانی، پێشنیاری بۆ حکوومەتەکەی کرد دەوڵەتێکی کوردی پێک بهێنرێ بەرەو باکوور تا شاری (وان) بگرێتەوە[70].

نۆئێل ئەم دەورانە هێشتا بە یەکجاری سلێمانیی بەجێنەهێشتبوو کە لە ماڵی شێخ مەحموود لەگەڵ چەند سەرخێڵ و گەورەپیاو خوێندەوارێکی شاردا ئامادەی ڕێکخستن و نووسینەوەی چەند مەزبەتەیەکی پشتگیری بوو، حسێن نازم هی کوردانی ڕۆژهەڵاتی بەدەستی خۆی بە تورکی یان فارسی نووسیبوەوە کە عیززەتی تۆپچی و عەبدوڵڵا ئاغای حاجی حەمەسەعید بە ڕاسپێریی شێخ نێردرابوونە ئەودیو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم بەشەی کارەکە[71]. ڕەفیق حیلمی ئەوانەی ترو نامەیەکی تایبەتیشی بۆ شەریف پاشای خەندان نووسییەوە. شەریف پاشا بەو بەڵگانە کرابووە دەمڕاستی کوردستانی باشوورو بەشێکی ڕۆژهەڵاتیش، تا لە کۆنگرەی ئاشتیدا بەناویانەوە داکۆکی لە مافەکانی کورد بکات. سەید ئەحمەدی بەرزنجی و ڕەشید زەکی کابانی فەرەنسیزان دیاری کران نامەو مەزبەتەکان بگەیەننە دەستی لە پاریس.

ئەو جووتە دوای ١٩١٩/٣/١٩ بەڕێکەوتن و بە وڵاتی سووریادا گەیشتنە شاری بەیرووت. بەڵام تێکچوونی نێوانی شێخ و ئینگلیزو بەرپابوونی شەڕی دەربەندی بازیان، سەفەرەکەیان پەک خست؛ کاربەدەستانی فەرەنسە بە فیتی ئینگلیز دەستگیریان کردن، هێنرانەوە

---

[70] کردستان في عهد السلام، القسم الثاني عشر.

[71] م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب٢، لەندەن، ١٩٩١، ل١٢.

مووسڵو حوکم دران[٧٢]. شێخ ئاڵۆزترین گیروگرفتی ئینگلیز بوو؛ بە قسەی ویلسن، لایەنگرانی فرەژمارە بوون، تەماعی زۆرو نفووزێکی گەورەیشی هەبوون[٧٣]. شێخ هەر بەو ناوچە بەرتەسکەی بەردەستی قایل نەبوو، بەڵکە بێپسانەوە هەوڵی دا خێڵە کوردەکانی هەولێرو ناوچە کوردنشینەکانی تری لیوای مووسڵیش بخاتە ناو قەڵەمڕەوی خۆی[٧٤]. نەك ئەوە، بگرە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە نوێنەری تێکڕای کوردانی ویلایەتی مووسڵو دیوی وڵاتی فارسیشە کە مەبەستیانە دەوڵەتێکی یەکگرتووی سەربەخۆ بە سەرۆکایەتیی ئەوو سەرپەرشتیی بریتانیا دابمەزرێت[٧٥].

کۆتاییی کانوونی یەکەمی ١٩١٨ کاربەدەستانی ئینگلیز کەوتنە گومانەوە لە پەرەگرتنو گەورەبوونی دەسەڵاتی شێخ تا ئەوڕادە فراوانە.

---

[٧٢] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: سدیق ساڵح، ڕەشید کابان نوێنەرێکی کوردستانی باشوور (ساڵی ١٩١٩)، "پەیڤین" (گۆڤار) ، سلێمانی، ژ٤، دیسەمبەری ١٩٩٨.

تائێستا بە هەڵە وتراوە ئەوانە لە (حەڵەب) گیراون، لەکاتێکدا خوالێخۆشبوو خالید کابان لە باوکیی بیستبوو کە لە (بەیرووت) دەستگیر کراون. ئەوانە کە ڕێگەی تێپەڕینی ناو خاکی تورکیایان نەبوە، زیاتر ڕێی تێئەچێ چووبنە بەیرووت تا لەوێوە بە پاپۆڕ لە دەریاوە بچنە فەڕەنسە. بەجێ نییە، بە ٣ مانگ تا شەڕی دەربەندی بازیان، ئەمجا گەیشتبنە حەڵەب !

[٧٣] سر أرنلد تي. ويلسون، المصدر نفسه، ج٣، ص٢٢،٢٣.

[٧٤] وليد حمدي، المصدر نفسه، ص٧١.

[٧٥] سر أرنلد تي. ويلسون، المصدر نفسه، ج٣، ص١٧.

ویلسن پێی وابوو تەماعەکانی شێخ لەچاو هی ئەو پێشەوایانەی تردا کە بریتانیا لە ناوەڕاستو خوارووی عیراقدا مامەڵەی لەتەکدا ئەکردن، دەگمەنو ناوازەن. هاوکات متمانە بە شێخ ناکرێ، مەگەر ڕێوشوێنی توند دابنرێ بۆ دیاریکردنی دەسەڵاتەکەی. ئەگەنا جڵەوی کاروبار لەدەست دەرئەچێ. بۆیە هاودەنگی دەستکاریکردنی سیاسەتیان بوو لە کوردستانی جنووبیدا؛ لەلایەکەوە بە گرتنەبەری ڕێگەیەکی بەڕێوەبردن کە هاوشێوەی هی ناوچەکانی تری عیراق بێو دەسەڵاتی شێخی تێدا دیاری بکرێ؛ لەلایەکی ترەوە هێندێ سەرۆکی نەیاریش لەدژی هان بدرێ[٧٦].

ئەگەرچی وەزارەتی هیندستانو وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا، تا پێچرانەوەی ئەو ڕۆژگارەیش، سیاسەتێکی کوردیی ڕوونو داڕێژراویان نەبوو، بەڵام هەردوولا بەردەوام دووپاتیان ئەکردەوە کە کوردستانی جنووبی نەخرێتە سەر دەوڵەتی عەرەبیی ئایندەی (عیراق). هەتا وەفدی بریتانیایش لە کۆنگرەی ئاشتیی پاریسدا، وای بۆ ئەچوو کە نابێ سنووری ئەو دەوڵەتە عەرەبیە تازەیە لە هێڵی ناوچەی عەرەبنشین واوەتر بچێ، هاوکات ویلسن لێبڕاوانە کاری بۆ ئەو پێوەلکاندنە ئەکردو پاساویشی بە هۆی ئابووریو ستراتیژی ئەدایەوە، چونکە ئەو هەرێمە

---

[٧٦] یقظة الکرد، ص٢٢٣، ٢٨٨؛ عبدالرحمن إدریس صالح البیاتي، الشیخ محمود الحفید (البرزنجي) والنفوذ البریطاني في کردستان العراق حتی عام ١٩٢٥، دار الحکمة– لندن، آذار ٢٠٠٥، ص١٢٩.

گۆشتو دانەوێڵەو میوەو تووتنو شتیوای بۆ دابین نەکردن، ئەبوە لەمپەریش لەبەردەم هەڕەشەی تورکیادا بۆ سەر عێراق[٧٧].

ویلسن کۆتاییی شوباتی ١٩١٩ بانگ کرایە پاریس، ئەمجا لەندەن. ئەو پێشنیارەی ڕەت کرایەوە، فەرمانی درایێ ناوچە کوردنشینەکانی ویلایەتی مووسڵ بکرێنە چەند دەوڵەتۆکەیەکی کوردیی سەربەخۆ، سەرانی کورد بە ڕاوێژی ئەفسەرانی سیاسیی ئینگلیز حوکمیان بکەن.

بەڵام کە گەڕایەوە، لەباتی ئەوە، نەخشەی بۆ کەمکردنەوەی دەستڕۆییی شێخ دانا کە ڕێگرێکی سەرسەختی بەردەم بەدیهاتنی بەرنامەکەی بوو، چونکە هێشتا کانوونی یەکەمی ١٩١٨ تەواو نەبووبوو کە لە پەلهاوێشتنی زیاتری دەسەڵاتی کەوتبوونە گومان، ئەویش ملی نەئەدا دەسەڵاتی دیاری بکرێو تێئەکۆشا کۆنترۆڵی زۆر کۆمەڵە عەشایەری گەورەتریش بکات. ویلسن لەگەڵ "نۆئێلو لیچمەنو سۆنو گۆردن"داکۆبووەوەو گفتوگۆی کرد، دواجار بڕیاری دا نۆئێل لەو کارە لابرێ، مێجەر سۆنی سەیرو تووڕەو بەزەبروزەنگ ناوەندی مارتی ١٩١٩ جێی بگرێتەوە[٧٨].

---

[٧٧] دافید کورن، المصدر نفسه/ ٢.

[٧٨] المس بیل، المصدر نفسه، ص١٩٨،١٩٧، ١٩٩—٢٠٠؛ ارنلد ویلسون، المصدر نفسه، ج٣، ص٢٤؛ م. ر. هاولر، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٦٣.

نۆئێل لەو ڕاپۆرتەی ساڵی ١٩٢١یدا وتوویە لابرام، نەك وەك ویلسن نووسیوویە، بە ڕەزامەندیی تەواوی خۆی لاچووبێ (م. ر. هاولر، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٦١).

نۆئێـل توندوتیـژیی نەئەنوانـد، لایـەنگری دامەزرانـدنی دەوڵـەتی کوردیو دژی لکاندنی کوردستانی جنووبی بوو بە ویلایەتەکانی بەغداو بەسرەوە. لـە ڕاپـۆرتی سـاڵی ١٩٢١یـدا ڕووی ڕاسـتی ئـەو مەسـەلەیەی دەرخستووە: ((تا شوباتی ١٩١٩ هیچ ناکۆکیو پشێوییەك لەئارادا نەبوە. شێخ ڕێی درابوو حوکمی ناوچەکانی نێوان سنووری ئێرانو زێی گەورە بکـات" بـەپێی ئـەو نەخـشەو دەسـتوورەیش ئەجوولایـەوە کـە بـۆی دانرابوون))[79]. لەوەبەدوا "گرینهاوس" بووە وەکیلی حاکمی سیاسی، لەکاتێکـدا "کـاپتن بـێل" یاریـدەدەری حـاکم بـوو، "مێجـەر دانلـیس" سەرپەرشـتیی ڕێکخـستنی هێـزی پیـادەو سـوارەی ئـەکرد کـە نـاوی (لیڤی)ی لێ نرا[80].

سۆن کە بەرێکەوە بوو بۆ سلێمانی، بە وردی لە بارودۆخی کفریو کـەرکووکی کۆڵییـەوە، سیاسـەتێکی بـۆ خـۆی داڕشـت پێـڕەوی بکـات. ژمارەیەك قەزاو ناحیەو هۆزی لە جوغزی دەسەلاتی شێخ هێنایە دەرێ. کە گەیشتە قایمقامیـەتی کفری لـە ناوەنـدی مارتـدا، مووچەی مانگانـەی بەسەر سەرانی تیرەکانی جافو بەگزادەکانیاندا دابەش کرد، کە پێشتر لە شێخیان وەرئەگرت. هەر لە مارتدا کفریو کەرکووك لە قەڵەمڕەوی شێخ کرانەوە، کران بە دەڤەرێکی تازە. لیز لە ١٩١٩/٣/١٥دا کرایە یاریدەدەری حـاکمی سیاسـیی کفـری، کەوتـە دابڕینـی بـاڵی دەستەڕاسـتی حکوومەتەکـەی شـێخ بـە پەیوەنـدیکردن بـە بـەگزادەکانی هەڵەبجـەو

[79] م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٥٩-٤٦٠، ٤٦١.

[80] یادداشت، ب١، ل٧٨، ٨٥.

عادیلەخانەوە. بەوپێیە، هەڵەبجەیش بوو بە ناوچەیەکی ژێر ڕکێفی خۆی، ئینگلیزەکان ڕاستەوخۆ بەڕێوەیان ئەبرد[81].

پیادەو سوارەیەکی زۆر پێزیەستەی بەخێرهێنانی سۆن بوون و زۆر چادریش بۆ چاوەڕێکردن لە (دەشتی موشیراوا) هەڵدرا. ڕۆژی ۱۹۱۹/٤/۲٤یش گەیشتە شاری سلێمانی[82]، هیچ ڕوویەکی نەدایە شێخ کە بۆ پێشوازیی هاتبوو[83]. سۆن تا دوادواییەکانی ئەو سەروبەندەی حوکمی شێخ ۱۹۱۹/٥/۲۰، بگرە لەوەبەدوایش، هەر مایەوە. "نۆئێل"یش هەر ئەو ماوەیە دەستی بە گەشتێکی درێژتر و نوێی خۆی کرد بۆ کوردستانی باکوور[84].

کاتێك مێجەر سۆن هێنرا، ویسترا شێخ لە خشتە ببەن بەوەی کە لەپاڵ مووچە ۱٥ هەزار ڕووپیەییەکەیدا هەموو جۆگەو موڵکەکانی سلێمانیی بدەنێ بەرهەمیان بخوات، دەستی پێهەڵبگرن لە حوکمداری. شێخ دوای ڕاوێژکردن بە نزیکەکانی، ڕەتی کردەوە[85].

---

[81] المس بيل، المصدر نفسه، ص۲۰۰؛ يقظة الكرد، ص۲۲٤؛ عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد ....، ص۱۳۲-۱۳۳.

[82] م. ر. هاولر، هەمان سەرچاوە، ب۱، ل٤٥۱.

[83] چیم دی، ب۱، ل۳۰؛ بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی، چ۲، ل۱٤.

[84] سەبارەت بەو گەشتەی بڕوانە: المس بيل، المصدر نفسه، ص۲۰۸-۲۱۸؛ یادداشتەکانی مەیجەر نۆئێل لە کوردستان، وەرگێڕانی حسێن احمد جاف و حسێن عثمان نێرگسەجاڕی، بغداد، ۱۹۸٤.

[85] م. ر. هاولر، هەمان سەرچاوە، ب۱، ل٤۳٦-٤۳۷؛ ڕەمزی قزاز، بزووتنەوەی سیاسی و ڕۆشنبیریی کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە تا ناوەڕاستی چەرخی بیست، سلێمانی، ۱۹۷۱، ل۲۲۰.

یەکەم حکوومەتی شێخ تاسەر دەسەڵاتی، کەموزۆر، لە ناوچەی سلێمانیدا گیری خوارد، زیاتر پەل نەهاوێشت. سۆن نەک هەر گەلێک ناوچەی لە چنگی شێخ دەرهێنا، بەڵکوو هێزەکانی لیڤی (۲۰۰۰ پیادەو ٤٠٠ سوار بوون) و پۆلیسی ڕاستەوخۆ خستنە ژێر دەستی خۆی[٨٦].
دەستیشی وەردایە ئیدارەی ناو شاری سلێمانی، ژمارەیەکی زۆر کاربەدەستو فەرمانبەری عەجەمو هیندیو عەرەبو ئەفغانیی تێڕژاند. دائیرەکانی حاکمی سیاسیو حاکمی عەسکەریو دارایی و گوومرگو ئەوانی تریش، هەریەکە یاریدەدەر یا ڕاوێژکارێکی ئینگلیزیان چووە سەر[٨٧]. هەر ئەو ڕۆژانەیش مووچەکەی شێخ کەم کرایەوە بۆ ١٠ هەزار ڕووپیە[٨٨].

"شێخ ئەمینی سندۆڵان"ی قایمقامی ڕانیە، بۆ لێدانو چاوشکاندنی شێخ لەناو لایەنگرانیدا، بە زەبرو ڕاسپاردەی کاربەدەستانی ئینگلیز لابرا، کاپتن بارکەر لە شوێنی بوو بە حاکمی سیاسی[٨٩].

پەوەندیی شێخ بە کاربەدەستانی ئینگلیزەوە، بەرەو ئەوپەڕی گرژیو پچڕان ئەچوو. تا لەم کاتەدا، ئەوی زانراوە، تۆفیق فیکرەتی ئەفسەری پێشووی عوسمانیی بە نوێنەریی خۆی ناردە تاران تا پێوەندی بە باڵوێزی ئەمریکاوە بکات، پشت بەستوو بە بەندەکانی سەرۆک ویلسن،

---

[٨٦] یادداشت، ب١، ل١١٥؛ لرنلد تي. ويلسون، المصدر نفسه، ج٣، ص٢٥.

[٨٧] یادداشت، ب١، ل٧٧ و، ب٢، ل١٠٧–١٠٨؛ چیم دی، ب١، ل٢٥، ٢٨.

[٨٨] م.ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤٤٨.

[٨٩] یادداشت، ب١، ل١٠٠؛ هەمان سەرچاوە، ب٢، ل١٠٥.

زۆرلێکراوی‌ی کوردو عەدالەتی مەسەلەکەیی بۆ ڕوون بکاتەوە. بەڵام هەر فەرمانبەرێکی باڵوێزخانەکەی دی، سەفەرەکەی ئەنجامێکی بەرچاوی نەبوو[٩٠].

شێخ نائومێد بوو، بڕیاری دا بە چەك لە ڕووی ئینگلیزدا ڕابوەستێ. ڕایسپارد مەحموود خانی دزڵی‌ی لایەنگری بە بیانووی زیارەتی کاك ئەحمەدی شێخ بەهێزێکەوە بێتە سلێمانی. ئەو هێزە (١٩١٩/٥/٢٠) گەیشتە سەر کەلی گۆیژە. سۆن بە بیانووی بەپیرەوەچوونی هاوسەرەکەی لە شاری بەسرە، خۆیی دزییەوە، مێجەر گرینهاوسی کردە جێگری خۆی، فەرمانی دا بەر بەو هێزە بگرن. بەڵام سپێدەی (٥/٢١) کە سوپای لیڤی، ڕەزا بەگی ئیسماعیل بەگ فەرماندەی پیادەو جەمال عیرفان فەرماندەی سوارەی بوو، بەرەنگاری هێزەکە بووەوە لە بناری گۆیژە، شکا. حسێنی مەلا محەمەدی عەتارو دوو ئینگلیزیش کوژران[٩١].

ئیتر شێخ بە چەند سەعاتێك کۆنترۆڵی شاری کرد، هەموو ئینگلیزەکانی گرت: شەش ئەفسەر (گرینهاوس‌و دۆگلاس‌و هۆڵت‌و ڕایت‌و دانلیس‌و شکۆفیل‌و بۆند)و نزیکەی دووسەد مەئموور کە هەر ١٥ مەئمووری هیندی‌ی گەورەیانی لێ گلدایەوە، لەگەڵ ئەفسەرەکاندا بە دیلی ناردنیە دەبۆکە. ئەمجا دەستی بەسەر خەزێنەو تۆمارکانی حکوومەتدا

---

[٩٠] الدكتور كمال مظهر احمد، أضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط، بغداد، ١٩٧٨، ص٢١؛ بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی، ل١٥.

[٩١] یادداشت، بەشی یەکەم/ ب٢، ل١١٥؛ هەمان سەرچاوە، بەشی دووەم/ ب٤، لاپەڕەی دووەمی پێشەکی.

گرت" هێڵی تەلەفۆنی نێوان سلێمانی- کەرکووکی بڕی، تا هەواڵی شار نەگاتە کاربەدەستانی ئینگلیز؛ ئاڵای بریتانیای لەسەر دائیرەی حاکمی سیاسی داگرت، ئاڵایەکی تایبەتی خۆی، وێنەی مانگێکی یەکشەوە لەناو بازنەیەکی ڕەنگ سووری سەر تەختی قوماشێکی سەوز، لەجێ دانا؛ خۆیشی کردە یەکەم حوکمداری کوردستانی جنووبی[92].

ویلسن، بەیانیی ڕۆژی دوایی، دوابەدوای ئەم ڕووداوە بە فڕۆکە هاتە سەر سلێمانی، ئەفسەرەکانی لە سەربانی دەبۆ بینی. بەیاننامەیەکی بۆ شێخ بەردایەوە، داوای تێدا لێ کرد بچێتە بەغدا تا چاوی پێ بکەوێ. چووە هەڵەبجەیش تا "لیز"ی یاریدەدەری حاکمی سیاسی لەگەڵ خۆیدا ببات. بەڵام نەیتوانی، عەشایەری ئەودیو سنوور بە هانای حامید بەگی جافی قایمقامی شێخەوە هاتبوون.

لیز دواتر بە هاوکاریی عادیلە خان ڕزگار بوو، گەیشتە خانەقین. بۆیە خانم ناسناوی "خان بەهادور"ی لە پاداشتی ئەو خزمەتەدا درایێ. ڕۆژی ٢٦ی ئایاریش، هەڵەبجە بە تەواوی کەوتە دەست شۆڕشگێڕانی شێخ[93].

---

[92] چیم دی، ب١، ل٣٧-٣٨، ٤١-٤٢؛ ب٣، سلێمانی، ١٩٧١، ل١٠٤؛ المس بیل، المصدر نفسه، ص٢٠٠، ٢٠١؛ سر ارنلد تي. ویلسون، المصدر نفسه، ج٣، ص٢٦؛ یادداشت، ب٢، ل١١١-١١٢.
ویلسن نووسیویە شێخ پووڵی پۆستەیشی دەرکرد کە هەڵەیە، ئەوە لە سێیەم حکوومەتی شێخ (حوزەیرانی ١٩٢٣- تەمووزی ١٩٢٤)دا بووە.

[93] سي. جي. ادموندز، کرد وترك وعرب، ص٣٤؛ سر ارنلد تي. ویلسون، المصدر نفسه، ج٣، ص٢٦-٢٧؛ المس بیل، المصدر نفسه، ص٢٠١؛ یادداشت، ب٢، ل١١٦.

قافڵەیەکی حکوومی لە کفرییەوە ڕووی کردە سلێمانی. هێزێکی شێخ لێی هاتە دەست، پەرێشانی کردو پارەو چەكو ئەسپی بە دەسکەوت کەوتە چنگ[٩٤].

ئەو ڕاپەڕینەی شێخ لە کوردستاندا دەنگی دایەوە، عەشایەر تا ناوچەی ڕەواندزیش کەوتنە خۆچەکدارکردنو چاوەڕوان بوون بتەنێتەوەو بەشداریی تێدا بکەن[٩٥]. ئەم ڕووداوە جێی داخە، بەقسەی ویلسن، ئەو قەناعەتە بڵاوەی ناو کوردستانی جنووبیی چەسپاند، کە پێی وایە ئینگلیز چیتر ناتوانێ کۆنترۆڵی وەزعەکە بکات. پریشکی شۆڕش پەڕییەوە بۆ سنووری ئێرانیش،چەند خێڵێکی حکوومەتی ئێران ڕاپەڕینو ڕایانگەیاند لایەنگری شێخ مەحموودنو پشتگیری لە خۆیو پرۆژەی کوردستانی یەکگرتووی ئازاد ئەکەن[٩٦].

شێخ بە فەرمانێکی حوکمداری (ژ٣، ١٩١٩/٥/٢٢) دەستەیەکی بە سەرۆکایەتیی سەید عومەرو ئەندامێتیی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگو سەید کەریمی سەید ئەحمەدو شێخ عەلی سەرکارو حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغاو ساڵح پاشاو حەمە بەگی قادر پاشا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حکوومەتی کوردستان هەڵبژارد[٩٧]. هاوکات نامەی بۆ سەرخێڵانی تری سۆرانو بادینان نووسی تا پشتگیریو هاوکاریی بکەن،

---

[٩٤] يقظة الكرد، ص٢٢٥.

[٩٥] یادداشت، ب٢، ل١٢٩.

[٩٦] يقظة الكرد، ص٢٢٥.

[٩٧] چیم دی، ب١، ل٤٤.

لەوانـە بـۆ نموونـە نامـەی بـە "فـەخری واسـیف بـەگ"دا نـارد بـۆ شـێخ ئەحمـەدی بارزان، بـەڵام ئـەو هێزەی کـە شـێخ ئەحمـەد بـۆی ڕەوانـە کـرد، دواکەوت و بە فریای نەگەیشت[98].

فەرمانـدەی کــەرکووک، پـاش ڕووداوەکــەی سـلێمانی، ۱۹۱۹/٥/۲٤ هێزێکی پێکهاتوو لە هەندێ سوارەو لیڤی‌ی عیراقی و ژمارەیەك زرێپۆش و ئوتـومبیلی سـەربەتاڵی ڕەشاشـی لـویس بەسـەرەوەی بـە فەرمانـدەیی‌ی "مێجـەر بـووم"ی گەیانـدە چەمچەماڵ، وا کـە لـەوێ جـێگیر بـێ. بـەڵام سەرکردەی ئـەو هێـزە هـیچ حـسێبێکی بـۆ قـەوارەو زەبـری هێـزی کـورد نـەکرد، بگـرە بـە چاوێکی سووکەوە تێـی ڕوانـی، بۆیـە لـەوێ گیر نـەبوو و یەکەوڕاست ڕووی کردە سلێمانی. هێزی کورد ۱۹۱۹/٥/۲٥ لـە تاسڵووجە هەڵی‌کوتایە سەری، بەزاندی‌و تا ۲٥ میلیش دوای کەوت؛ چەندین زیـانی قورسـی مـاڵی و گیـانیی پـێگەیاند، چـوار زرێپـۆش و نـۆزدە ئوتـومبیلی لێ تێك شکاند[99]. حاجی حەمە ئاغای مامی عەلی‌ی حەسەن ئاغـای ئاوکورتـێ لەو شەڕەدا بریندارو عەبدوڵڵا ئاغای برای شەهید بوو[100]. محێدین ئـەمین دۆغـری‌ی جـەباریش شـەهیدێکی تـری ئـەو شـەڕە بـوو[101]. هێزێکـی تـری

---

[98] چیم دی، ب۱، ل ۳۹-٤۰؛ م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب۱، ل٤٨٦.

[99] کـرد وتـرك وعـرب، ص٣٤؛ سـر أرنلـد تـي. ويلـسون، المـصدر نفسه، ج٣، ص٢٧؛ م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب۱، ل٤٩٦.

[100] یادداشتی عەلی‌ی حەسەن ئاغای ئاوکورتێ، ل۱-۲ (دەستخەت: بۆ مامۆستا عەبدوڕڕەقیب یووسفی نووسیوەتەوە).

[101] عبدالرقیب یوسف، لە کەلەپووری بەڵگەنامەیی کوردی/۱، "ڕۆشنبیری نوێ" (گۆڤار)، بەغدا، ژ۱۱۰، ۱۹۸٦.

کوردیش به فەرماندەیی‌ی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند چەمچەماڵی داگیر کرد، کاپتن بۆندی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی بەدیلی گرت‌و بردیە سلێمانی[١٠٢].

شێخ لەوەبەدوا ئیسماعیل حەقی شاوەیسی بە نامەی فارسی‌ی خۆیەوە ڕەوانەی کەرکووک کرد تا لە نیازی ئینگلیز بگات، داوایان لێ بکات گفت‌و بەڵێنەکانیان دەرهەق بە کورد جێبەجێ بکەن. لەوێ جەنەڕاڵ فرایزەری دی، بێ‌ئەنجام گەڕایەوە[١٠٣].

شێخ قادری حەفید بە فەرمانی شێخ بە هێزێکی ٥٠٠ سوارەوە چووە (بنە)ی دێیەکی ئەولای باکووری چەمچەماڵ، تا ڕێی هاتوچۆی نێوان کەرکووک‌و چەمچەماڵ ببڕێ‌و بەر بە هاتنی هێزی ئینگلیز بگرێ. هێزێکی ئینگلیز لە ٢٩ی مایسدا ویستی خۆی بگەیەنێتە چەمچەماڵ، لێی دراو شکێنرا.

ستوونێکی تر دوابەدوای ئەو، بە فەرماندەیی‌ی مێجەر فرایزەر بەرەو دێی قەرەهەنجیر چوو کە ١٧ کم لەکەرکووکەوە دوورە، هێزێکی شێخ بە فەرماندەیی‌ی مەحموودخانی دزڵی ئابلووقەی دا؛ بە یارمەتیی هێزێکی تری ئینگلیز ئەمجا ڕزگاری بوو، کشایەوە بۆ کەرکووک. ٦/١ دووبارە بە هاوکاریی هێزی ئاسمانی هێرشی بردەوە، شوێن‌و دێهاتەکانی کورد

---

[١٠٢] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص١٤٢.

[١٠٣] اسماعیل حقی شاوەیس، حکومەتی کوردستان، "ڕۆژی نوێ" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ٥، ئابی ١٩٦٠؛ یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، کەمال نوری مەعرووف ساغی کردووەتەوە، دهۆك، ١٩٩٥، ل٥٧.

بۆردومـان کـران؛ بۆمبابـارانی دێی (بنـه)ی بـاکوورو دێی (تیمـار)ی باشووری ڕۆژهەڵاتی چەمچەماڵیشی کرد، زیانێکی قورسی پێ گەیاندن. لەبەر ئەوە هێزەکەی شێخ لە قەرەهەنجیر پاشەکشەی کرد[104].

شـێخیش ئـەو ماوەیـە لەگـەڵ پێـشمەرگەکانیدا لـە بـەری خـواروی دەربەندی بازیان سەنگەری گرت، هێزێکی تێکەڵ لـە چەکداری عەشایەرو لیڤی مەشقپێکراویش لـە بەری سەروویدا کۆکرایـەوەو جێگیر کرا[105]. شێخ نەیویست لەدواوە فەرمانـدەیی چەکدارەکانی بکات. ئەمە نیشانەی دوو مـەرجی دیـاری پێـشەوایەتین: ئازایـەتی و بـاوەڕ بـە کێـشەکە[106]. دەنگـۆی هەسـتانی شـێخ، تـا ڕەوانـدز تەنییـەوە. عەشـایەری بەتایبـەت ناڕازی لە ئینگلیز کەوتنە خۆپڕچەککردن و خۆسازدان بۆ شەڕ؛ چاوەڕوان بـوون شـەڕ بپەڕێتـەوە بـۆ ئـەودیوی زێی پـچووک و لەشـکری شـێخ نزیـك بکەوێتـەوەو بـەری کۆیـە بگـرێ، تـا ئـەوانیش ڕاسـت ببنـەوە. لەبـەر ئـەوە باس و خواسی سەیروسەمەرەی هەڵبەستراو بڵاو ئەبووەوە[107].

یەکـــەم بـــەلاغی فەرمانـــدەیی هێزەکـــانی داگیرکـــەری عـــیراق لـــە ١٩١٩/٥/٢٨دا ڕایگەیاند: ((شێخ مەحموود ناخافڵ لـە ڕۆژی ٢٦ی ئایـاری ١٩١٩دا جڵـەوی کاروبـاری حـوکمی لـە سـلێمانی گرتـە دەسـت، هەنـدێ

---

[104] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص١٤٤؛ چيم دی، ب١، ل٤٦؛ یادداشت، ب٢، ل١٢١-١٢٢.

[105] كرد وترك وعرب، ص٤٩.

[106] يقظة الكرد، ص٢٢٦.

[107] یادداشت، ب٢، ل١٢٩.

ئەفسەرو کەسی ئینگلیزی بە دیلی دەستگیر کرد. بۆیە هێزێکی سەربازەکانمان لە ۲٥ی مانگدا دەستبەجێ ڕووی کردە چەمچەماڵ. هێزێکی سۆراخکردن گەیشتە دەربەندی تاسلووجەو ئەمجا چەمچەماڵ. هێزێکمان سازوتەیارە بە جۆرەها ئامرازی جەنگی، حالی حازر لە کەرکووك کۆبووەتەوە[108])). سەرانی ناوچەی ڕانیەو پشدەر، لەوانە غەفوورخانی سەرۆکی ئاکۆو سواراغای محەمەد ئاغای سەرۆکی پیران‌و عەباسی مەحموود ئاغای سەرۆکێکی پشدەر، دوادواییەکانی ئایاری ۱۹۱۹ بە چەکدارەکانیانەوە ڕوویانکردە ڕانیە، "کاپتن بارکەر"یان ناچار کرد ئەوێ بەجێ بهێڵێ‌و بچێتە کۆیە[109].

لایەنگرانی شێخ ڕوویانکردە کۆیەو لەگەڵ خەڵکە ڕاپەڕیوەکەدا بەگژ دەسەڵاتدارانی ئینگلیزدا چوون. عەبدوڵڵا ئاغای گەورەپیاوێکی شار، کاپتن ڕاندەڵی یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی ئاگادار کردەوە کە شار بەجێ بهێڵێ، ئەگەنا بەزۆر دەری ئەکەن. بۆیە ناچار چووە کەرکووك. ئینگلیز لە ۱۰/٦دا، دوای بۆردومانێکی ئاسمانی، کۆیەی بە هێزێکەوە گرتەوە. ڕووی کردە ڕانیەیش‌و گرتی[110].

جەنراڵ تیۆدۆر فرایزەری سەرکردەی تیپی هەژدەهەم لە مووسڵ، فەرمانی درایێ هێزێك لە دوو لیوای پیادەو سوارەو ئوتومبیلی چەكدار بەناوی (هێزی کوردستانی جنووبی)یەوە کۆبکاتەوە، بە خێرایی بجووڵێ.

---

[108] عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ص٢٧١.

[109] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص١٤٥.

[110] هەمان سەرچاوە، ل١٤٥.

هێزێکی بچووکی پیادەو تۆپخانەی چیاییش بە سەرکردەیی‌ی موقەددەم بۆید لەنزیکی خانەقینەوە بەرەو ژوور نێردرا. هێزەکەی فرایزەر ناوەندی حوزەیرانی ۱۹۱۹ لە چەمچەماڵ مۆڵی خوارد، ٦/١٦ دەستی کرد بە چوونەپێشەوە بەرەو دەربەند؛ ٦/١٧ بەشێکی ئەو هێزە لە دێی (تەکیەی کاکەمەند)ی ۳ میلی باشووری ڕۆژاوای دەربەند بە هێزی کورددا هەڵپژا، بڵاوەی پێ کرد. شەوی ١٨/١٧ی حوزەیران هێزی پیادە پەلاماری برد، سەربازانی تۆپخانەی چیایی بە بەرزاییەکاندا هەڵگەڕان، تا لە هەموولایەکەوە گەمارۆی هێزەکانی شێخ بدەن؛ بە تووڵەڕێکانی لای دەستەڕاستی شاخدا چوونە ئەودیو، پشتیان لێ گرتن. موشیر ئاغای محەمەد سلێمان ئاغای هەمەوەندی فەرماندەی پێشووی هێزی سوارەی شێخ لە چەمچەماڵ هاوکاری‌و چاوساغیی کردن. بەرەبەیانی ٦/١٨ هێزەکانی شێخ تۆپباران کران. سەعات ۳،١٥ی بەیانی هێزێکی پیادە پەلاماری قولەکانی هێزی کوردی دا لە هەردوو بەری دەربەنددا. هێزێکی تریش بە پشتیوانی‌ی تۆپخانە هێرشی هێنایە سەر دەربەند خۆی.

هێزەکانی شێخ خافڵگیر کران، لە هەموولایەکەوە بەر دەستڕێژ دران. کەچی تەسلیم نەبوون، ئەوەندەی پێیان کرا بەرەنگاری‌و شەڕیان کرد. بەڵام هێزەکانی بریتانیا، بە حوکمی ژمارە زۆری‌و پێشکەوتوویی‌ی چەك‌و ئامرازی جەنگی، سەرکەوت. شەڕ هەر دوو سەعاتی خایاند. شێخ قولەپێیەکی‌و کەمەری بریندار بوون، لەگەڵ زیاتر لە سەد کەسی هێزەکەیدا بە دیل گیرا، ٤٨ شەهیدیش هەبوون، لەوانە حاجی سەید حەسەن، تایەری محەمەد ئەفەندی‌ی فەرخە‌و مولازم ڕەشیدی عاسیەخان‌و

شێخ تەهای ئامۆزای شێخ مارفی شووکێ[111]. بەڵام شێخ مارفی شێخ مستەفای شووکێ بە برینداری کەوتە دەست هێزی ئینگلیزو بێسەروشوێن کرا[112].

ڕەعیلی سوارەی ٣٢یش، بە فەرماندەیی‌ی مولازم دینیهای، هەر ئەو ڕۆژەو پاش یەکلاییبوونەوەی شەڕەکە، بەخێرایی ملی نا بەرەو سلێمانی تا لە سەعات ٦,٥ی ئێوارەدا کە هێشتا خەڵکی شار لە هەواڵی ئاکامی شەڕ بێئاگابوون، گەیشتە جێ؛ دەم‌ودەست چووە دەبۆکەو ئەفسەرەکانی

---

[111] هەمان سەرچاوە، ١٤٨-١٤٩؛ کرد وترك وعرب، ل٣٤-٣٥، ٤٩، ٥٠؛ یادداشت، ب٢، ل١٢٤-١٢٧؛ هەمان سەرچاوە، ب٤، لاپەڕەی دووەمی پێشەکی؛ چیم دی، ب١، ل٤٧؛ سر أرنلد تي. ویلسون، المصدر نفسه، ج٣، ص٢٩؛ ئاکۆ غەریب، شێخ مارف یەکەمین مەفقودی شۆڕشی شێخ مەحمود، "خاك" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ٢٩، تشرینی دووەمی ١٩٩٩، ل١٧؛ زانیاری‌ی ڕۆژی ١١/١٠/٢٠٠٦ی بەڕێز دکتۆر عوسمان شێخ عەبدوول.

[112] جێی وتنە، شێخ مارف کوڕی شێخ مستەفا کوڕی شێخ حسێن کوڕی سەید ئەحمەد کوڕی شێخ تەهای گەورەیە. لە دێی (شووکێ) دانیشتووە. لە شەڕی تەکیەی پشت دەربەندا بریندابووە. دواتر بەشداری‌ی شەڕی (دەربەندی بازیان)یشی کردووەو بە توندی بریندار بووە" لەبەر سەختی‌ی برینکەی، نەیتوانیوە خۆی بگەیەنێتە (ماین تەیارە) ناوەکەی‌و دەستگیر کراوە. ئیتر ون کراوە. دوای شەڕ، ماڵو منالی ئاوارەی دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە، تا پایزێکی درەنگ لە (هەنگەژاڵ) ماوەتەوە. کە گەڕاوەتەوە، میرزا فەرەجی حاجی شەریف دوو هەزار ڕووپیە سزای داگیرکردنی موڵکەکانیی داوە (بڕوانە: هەمان بابەتی گۆڤاری"خاك").

ئینگلیـزی ئـازادکرد. هێزەکـانی تـری ئینگلیـزیش ڕۆژی دوایـی (٦/١٩) نزیکی شـار بوونـەوە، بەشـی زۆریـان لای پـردی قلیاسـان چادریان هەڵدا. ئەدمۆندزو کۆمەڵێك سوارە سەعاتێکی پێشنیوەڕۆ چوونە ناو شار.

دەستبەجێ کاپتن بۆنـد لەگەڵ ئەفسەرێکی کورددا نێردرایە بازیـانو دڵنیـابوون کـە ئـەو دیلـە گەورەیـە شـێخە، واتـە شـێخ تـا (٦/١٩) هـەر لـەوناوەدا هێڵرابـوەوە. ڕۆژی (٦/٢٣)یـش سـەرجەمی هێـزی ئینگلیـز گەیشتە ناو شار. هێزەکەی خانەقینیش، پاشتر لەگەڵ هێزێکی سلێمانیدا هەڵەبجەیان داگیر کردەوە، هەر"لیز"یشی بۆ برایەوە[١١٣].

ئەم بەلاغـە لـە سلێمانی بـە کوردی بڵاو کرایـەوە: ((ئـەو هێزانەی کـە شێخ مـەحموود کـۆی کردنـەوە لـە دەربەنـدی بازیـان، بـە تـەواوی تێـك شکێنران. دەرکەوت زۆری لایەنگرانی شێخ کوژرانو نزیکـەی ١٠٠یان لێ بەدیل گیرا. گەلێك تفەنگو چەکی جەنگیی تر دەسکەوت هـەبوو. بینـرا شێخ مەحموود بـە تونـدی برینـدار کرابـوو، بە تـەنیا لـە مەیدانی جەنگدا کـەوتبوو، هـەموو لایـەنگرەکانی بـەجێیان هێـشتبوو؛ هـەڵگیرا بـۆ خەسـتەخانە، پزیـشکان چارەسـەری ئەکـەنو بایـەخ بـە تیمـارکردنی ئەدەن))[١١٤].

سـەربازانی هێـزی بریتانیـا لـە دەوروبـەرو شیوەکانی سـلێمانی بـڵاو بوونـەوە، هـەر کەسـێ ڕێـی بگرتنایـە دەسـتگیریان ئـەکرد. ٦/٢٥ دەوری

---

[١١٣] کرد وترك وعرب، ص٤٩-٥٠، ٥١-٥٢؛ بیل، المصدر نفسه، ص٢٠٣.

[١١٤] عبدالرحمن إدریس صالح البیاتي، المصدر نفسه، ص١٥١.

دێی (وێڵەدەر)یان دا، برێك چەكیان لێ گرت و زەوت كرد. لە ٦/٢٧دا ڕوویان كردە (داریكەلی) و داگیریان كرد. دێی (خێوەتە)یشیان گرت؛ وتیان شێخ قادری سمایل عوزێری خۆیی تێدا شاردبوەوەو توانیی رابكات. هێزێكی تریان بەرەو هەڵەبجە چوو. لایەنگرانی شێخ كە لە دێی (وێلەكە)ی ٤٠كم دوور لە سلێمانی بەرەنگاری بوونەوە، بڵاوەیان پێ كرا، ئەویش لە ٦/٢٨دا چووە ناو هەڵەبجە. سریەیەكی تری بریتانی كە لە سلێمانییەوە هاتبوو، چووە پاڵی، كشان بەرەو دێی (عەبابەیلێ)؛ خەڵكەكەی چۆڵی كردبوو. سریەیەكی تر لە هەڵەبجەوە ڕووی كردە گوڵعەنبەر (خورماڵ)، بەبێ بەرگری گرتی. چەند سریەیەك لە تەمووزدا كێومالی دۆڵەكانی خورماڵ و بەرزنجەو ئەو ناوەیان كرد، لایەنگرانی شێخیان تێدا ئەگرتن، یا هەڵئەهاتن.

دوو مەفرەزە ١٠ ڕۆژی كۆتایی‌ی تەمووز لە ناوچەی (قەرەداخ) گەڕا بەدوای پیاوەكانی شێخدا" چووە دێی (قازان) و (ڕەبات) و (ئیبراهیم خانچی) و هی تر، ماڵەكانیان پشكنی؛ گەلێ كەسی بەشداری جووڵانەوەكەی شێخ گیرا، ژمارەیەكی زۆری چەك و كەلوپەلی تایبەتیان لێ زەوت كردن. دەست كرا بە دانانی حامیەیەكی عەسكەری لەو ناوچەیە بۆ پشتیوانی‌ی دەسەڵاتی ئینگلیز كە لە سلێمانی ڕێك ئەخرایەوە. بەو شێوەیە ناوچەكانی سووورداش و شارباژێڕو بەرزنجەو پێنجوێن و خورماڵ و قەرەداغ و سەنگاو پشكنران[١١٥].

---

[١١٥] هەمان سەرچاوە، ل١٥١-١٥٢ (لە ژمارە ٦٢١ی ١٩١٩/٨/٥ی ڕۆژنامەی "العرب" وەرگیراوە)؛ كرد وترك وعرب، ص٥٢، ٥٣.

فەرمانـــدەیی عەســـکەری بریتانیـــا، ســـەرکوتکردنی ئـــەو جووڵانەوەیەی کرد بە بەهانە بۆ یەکلاییکردنەوەی حیسابی خۆی لەگەڵ سەرجەمی نەیارەکانیدا لـە کوردستان؛ ئەوە بـوو دەسـتی بـە پـشکنین‌و گـەڕان کـرد، ٨/١ گەیـشتە دێی (بامـەڕنی)ی نزیکـی ئامێـدی، ئەوانـە دەستگیر کران کە پێشتر چەکیان لە ڕووی ئینگلیزدا بەرز کردبووەوە. ٨/٦ چووە شارۆچکەی ئامێدی، هەندێك لە گیراوەکانی ئیعدام کرد. خەڵکیش ٨/٨ تۆڵەی لە هێزەکەی جێگیری ئەوێ کردەوەو زیانی گیانی‌و ماڵیی پـێ گەیاند.

چالاکی لە ڕۆژاوای ڕووباری خابووریش نوێنراو دۆڵی گۆیان گیرا. بەڵام ڕۆڵـەکانی ئـەو هـۆزە بەرگرییـەکی دلێرانـەی وایـان کـرد کـە ویلـسن بڵـێ: ((ئەمانە دڕندەترین هۆزن کە ناچارین مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین))[116]. ١٢ی ئاب بەیاننامەیەك بڵاوکرایەوە سەبارەت بە بەرقەراربوونی ئاسایش‌و ئارامی لە پەراوپەری کوردستانی جنووبیدا[117].

ئەو هەلومەرجە ماڵەکانی شێخ مەحموودو چەندین سەرکردەو ئەفسەرو لایـەنگری وەك حـاجی سـەید عومـەرو حـاجی سـەید حەسـەن‌و تایـەری محەمـەد ئەفەنـدی‌و عیززەت نـەجیب‌و کاکەحەمـەی ئـەمین عـەتارو ئەحمـەد بەگی فەتاح بـەگ‌و سەید نـووری‌ی نەقیب‌و سەید کـەریمی سەید ئەحمەد، بەگشتی نزیکـەی سـەد ماڵێـك تـاڵان کـران[118]. ئیتر خێزانـی شـێخ‌و دەوری

---

[116] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص١٥٢-١٥٣.

[117] كرد وترك وعرب، ص٥٣.

[118] چیم دی، ب١، ل٥٠-٥١.

سێ‌سەد خێزانێکی تر لە شار هەڵاتن‌و خۆیان دەرباز کرد، ئاوارەو پەرپووەی دێهات‌و ناوچەکانی دەوری سلێمانی‌و کوردستانی ئێران‌و تەنانەت لای شاری (وان)یش بوون[119].

شێخ مەحموودو شێخ محەمەد غەریبی زاوای، لەگەڵ دیلەکانی تردا کە ژمارەیەك ئەفسەری وەك قالەی ئایشەخان‌و ئەدهەم ئەفەندی‌و محەمەد ئەفەندی‌ی قەرەداغی‌و عەلی یاوەری ساڵح پاشاو ڕەشید سدقی غەفوورو عیززەتی تۆپچی‌و ڕەشید جەودەت"یان لەناو دابوو، گەیەنرانە بەغدا[120]. شێخ سەرەتا بۆ چارەسەر برایە نەخۆشخانە. ویلسن لەوێ سەری لێ دا، شێخ پێی وت: هیچ دادگایەکی عەسکەری ناتوانێ موحاکەمەی بکات. بازیبەندەکەی دەستیی کردەوە، دەقی بە کوردی نووسراوی هەر چواردە بەندەکەی "ویلسن"ی سەرکۆماری ئەمریکاو ڕاگەیاندنی ١٩١٨/١١/٨ی بریتانیا- فەرەنسەی لەسەر دیوی ناوەوەی بەرگی قورئانێکدا پیشان دا تا ناوەڕۆکیانی بیر بێنێتەوە[121].

---

[119] بۆ درێژەی ئەو بەسەرهاتە بڕوانە: چیم دی، ب١، ل٥١-٥٢؛ یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل٦٦-٧٨؛ مەلا عەبدوڵڵای زێوەر، گەنجینەی مەردان‌و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، محەمەدی مەلا کەریم هێناونیەتە سەر شێوە نووسینی نوێ‌و پێشەکی‌و پەراوێزی بۆ نووسیون، بەغدا، ١٩٨٥، ل١٥٢-١٩٥.

[120] چیم دی، ب١، ل٤٩؛ یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل٦١؛ یادداشت، ب٢، ل١٦٤.

[121] سر ارنلد تي. ويلسون، ج٢، ص٣٠.

لەکاتێکدا ویلسن دەمێك بوو گاڵتەی بە تایبەت بە بەندی دوازدەهەمی ئەو بەندانە ئەهات کە سەبارەت بە ڕزگاریی گەلانی ژێر دەستی عوسمانی بوو، ناوی نابوو ((وەسێتی دوازدەهەم)). تەنانەت نەیهێشت تا تشرینی یەکەمی ۱۹۱۸ لە ناوچەکانی حوکمی خۆیدا بڵاوببنەوە[۱۲۲].

شێخ مەحموودو شێخ محەمەد غەریبی زاوای خرانە بەندیخانەی (هنیدی) تا ڕۆژی (۱۹۱۹/۷/۲۵) کە درانە دادگایەکی عورفیی عەسکەری[۱۲۳]. میرزا فەرەجی حاجی شەریف و حەمەبەگی قادر پاشاو شێخ نەجیبی قەرەداغی و عیززەت بەگی وەسمان پاشاو عەونی ئەفەندیی حاجی گووروون و حاجی مەلا سەعیدی کەرکووکلی زادەو حاجی ئاغای حەسەن ئاغایش وەك شایەت لە سلێمانییەوە برانە بەغدا. شێخ تاوانی شۆڕشکردن و بەرهەڵستیی ئینگلیز بە چەك و داگرتن و سووکایەتیکردن بە ئاڵای بریتانیای درایە پاڵ. بەڵام ئەگەرچی حوکمی ئیعدامی درا، مەردانە داکۆکیی لە خۆی و کێشەی میللەتەکەی کرد، ڕوونی کردەوە کە ئینگلیز بە خواستی کوردو بەبێ شەڕ هاتە کوردستانی جنووبی و بڕیاری دا بیکاتە حوکمدار، بەڵام لەگەڵیدا سەرڕاست دەرنەچوو. لەبەرئەوە بەو حوکمەی دادگا ڕازی نییەو دادپەروەریی تێدا نابینێ. هەتا بەڕادەیەك توورە بوو، سەروپێچکەیی بە توندی دا بەسەر سنگی سەرۆکی دادگادا[۱۲۴].

---

[۱۲۲] دافید کورن، المصدر نفسه/ ۲.

[۱۲۳] م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب۱، ل۵۲۱، ۵۲۹.

[۱۲٤] چیم دی، ب۱، ل۵۳-٥٤؛ یادداشت، ب۲، ل١٦٥-١٦٧؛ یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل٦١-٦٢.

جەنراڵ سێر جۆرج ماكمۆنی سەركردەی گشتیی ئەودەمەی هێزەكانی ئینگلیز، لەوبارەیەوە وتوویە: ((ئەمزانی شێخ نامەردێكی نەفرەتییە، خەڵك لە منیان ئەوێ بیخنكێنم. بەڵام پێم وابوو ئەوە هیچ ویژدانو دادێكی تێدا نییە. یەكلاییكردنەوەی كێشەی پاشەڕۆژی عیراق، بە ڕادەیەك هێواش بوو مرۆڤی سەرسام ئەكرد. شێخ مەحموودیش قەرزارباری لایەنگرییەكی كاتیی ئینگلیز نەبوو. كاتێ ڕاپەڕی، هەر چوار یا پێنج ئەفسەرە دیلەكەی نەكوشت. لەبەر ئەوە پێم وانەبوو عادیلانە گەمەیەكی ئینگلیزی ئەكەم، ئەگەر فەرمانم بدایە گوللەبارانی بكەن))[١٢٥].

بۆیە ئەو سزایەی بۆ كردە زیندانی هەمیشەیی، كەمتریش كرایەوە بۆ ١٠ ساڵ زیندانی. شێخ محەمەد غەریبیش حوكمی پێنج ساڵ زیندانو غەرامەی ١٠ هەزار ڕووپیەی درا. ویلسن بە ڕەسمی بە ئیعدامنەكردنی

---

شایانی باسە، وەك ئەحمەد خواجە نووسیویە، پێناچێ ئەوە گرینهاوس بووبێ كە شێخ سەرپێچكەی داوە بە سنگیدا، چونكە ناوبراو– بەقسەی ئەدمۆندز– دوای هاتنە ناوەوەی هێزەكانی ئینگلیز هەر ماوەتەوەو مانگی تەمووز لەبەر شارەزاییی ناوچەكە، یاوەریی ستوونەكانی كردووە بۆ پشكنینی ناوچەكانی دەوروبەری شارو ئەو كارە تا ناوەندی ئابی خایاندووە. سەرەتای ئابیش مۆڵەتی وەرگرتووەو سەفەری كردووە (كرد وترك وعرب، ص٥٢، ٩٠). هیچ بەڵگەیەكیش بەدەستەوە نییە كە ئەوە، وەك شێخ لەتیف وتوویە، دانلیس بووبێ. ئەوەندە هەیە شایەتەكان لەگەڵ كاپتن بۆندی حاكمی سیاسیی چەمچەماڵدا چوونەتە بەغدا. بۆیە دوور نییە ئەو بووبێ.

[١٢٥] يقظة الكرد، ص٢٢٧؛ دافيد كورن، المصدر نفسه/ ٣–٤، "الاتحاد"، العدد ٣٢٥، ١٩٩٩/٧/٢.

شێخ ناڕازی بوو؛ وای بۆ ئەچوو تا شێخ زیندوو بێ، لایەنگرانی هیوادارو ناحەزانیشی زارەترەك ئەبن. لەبەرئەوە مردنیی بەلاوە گرنگترین هۆکاری سەقامگیربوونی ئاشتی و ئارامی بوو[126].

دواجار شێخ، لەگەڵ شێخ حەمەغەریبی زاوایدا، دوور خرانەوە بۆ دوورگەی (ئەندامان) لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ناو دەریای هیندی[127]، دیلەکانی تریش ماوەیەك لە بەندیخانەدا مانەوە، دوای ۱۰ هەفتە بەردران[128]. لەوەبەدوایش سەردەمی حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز، بەتایبەت لە ناوچەی سلێمانیدا، دەستی پێکرد.

### ۲. ۲. دووەم حکوومەتی کوردستان (۱۹۲۲/۱۰/۹–۳/ ۱۹۲۳/۳)؛

#### ۲. ۲. ۱. یەکەم خولی حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز لە سلێمانی (۱۹۱۹/٦/۱۹–۱۹۲۲/۹/٤)؛

شێخ مەحموود ئەیویست ئینگلیز یاریدەی بدات تا کورد، دوای وێرانکاریەکانی جەنگ، بکەوێتە سەر پێی خۆی و فێری شێوەی نوێی حوکم ببێ و لە چاوتێبڕینی تورك و فارس و عەرەبیش لای بدات؛ پێی

[126] سر أرنلد تي. ويلسون، المصدر نفسه، ج٣، ص٣٠؛ المس بيل، ص٢٠٣؛ یادداشت، ب٢، ل١٦٩؛ یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل٦٥.

[127] چیم دی، ب١، ل٥٥؛ یادداشت، ب٢، ل١٦٩؛ یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل٦٥؛ كرد وترك وعرب، ص٥٣.

[128] ويلسون، المصدر نفسه، ج٣، ص٢٩.

وابوو هاتنی ئینگلیز مایەی ڕزگاربوونە لە حوکمی ساڵەهای تورك، هەلێکی لەباریشە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بە سەرۆکایەتیی خۆی. بەڵام ئەوەی بۆ بەدی نەهات، کۆتاییی یەکەم حوکمداریەکەی، دوور خرایەوە بۆ هیندستان.

لەکاتێکدا ویلسن بە باشی ئەزانی چەند دەوڵەتۆکەیەکی کوردیی سەربەخۆ لە کوردستانی جنووبی دابمەزرێنرێ، بە سەرۆکایەتیی چەند کوردێکی هەڵکەوتوو و بە سەرپەرشتیی بریتانیا[١٢٩]. مەبەستی لەوە بەدیهێنانی ئارەزووی خەڵك و سەرانی کوردی ناوچەکەو ڕێگرتن لە یەککگرتنی هەموو کورد بوو. بەوە ئامانجی خۆیان جێبەجێ ئەکرد. هاوکات نۆئێل پێی وابوو نابێ کوردستان پارچەپارچە بکرێ، ئەبێ دەوڵەتێکی یەککگرتووی لێ پێك بهێنرێ. پێشنیاریشی کرد سنووری کوردی بەپێی هێڵی ئەتنۆلۆجیی نێوان کوردو عەرەب دیاری بکرێ. لەڕووەوە وای بۆ ئەچوو کە هێڵی درێژکراوە لەفوراتەوە تا مووسڵ کەموزۆر سنووری لای باشوور دەست نیشان ئەکات" هێڵی نەتەوەییی نێوان عەرەب و کوردیش لە مووسڵەوە تا خوارووی خانەقین درێژ ئەبێتەوە.

هەرچی سنووری ڕۆژهەڵاتە، لەفارسەوە ئەکشێ و هەردوو ناوچەی سنەو سەقز ئەگرێتەوە، لەوێوە تا دەریاچەی ورمێ و سنووری ڕووسیا و نزیکی چیای ئاڕارات. سنووری باکووریش لەگەڵ هێڵە تەریبەکان (هێڵی

---

[١٢٩] ولسن، المصدر نفسه، ج٢، ص٣٧.

درێـژی‌و پـانی)دا بـه پلـه‌ی ٣٥ جـووت دێتـه‌وه[١٣٠]. بـه‌ڵام ویلـسن بـه‌م دیاریکردنه ڕازی نه‌بوو.

دائیره‌ی پێشووی ئه‌فسه‌ری سیاسی که بینای قوتابخانه‌ی ئه‌عدادی‌ی ده‌ورانـی حوکمی عوسمـانی بوو، ساڵی ١٩١١ به پیتاکی خه‌ڵك دروست کرابوو، لـه یه‌کـه‌م خولی حوکمی ڕاسته‌وخۆی ئینگلیزدا کرایه باره‌گای عه‌سکه‌ری. خه‌ڵکه‌که داوایان کرد چۆڵی که‌ن، بۆیـه ناچار گوێزایانـه‌وه بۆ ده‌بۆی عه‌سکه‌ری‌ی سه‌ر گردی قشڵه[١٣١].

مێجـه‌ر سـۆن کـه پـێش ڕووداوه‌کـانی مـایس-حـوزه‌یرانی ١٩١٩ سلێمانیی به‌جێهێشتبوو، ١٩١٩/٧/١ هاته‌وه. ٨/١٣ به‌یاننامه‌یه‌ك ده‌رکرا سـه‌باره‌ت بـه دابینبـوونی ئاسـایش‌و ئـارامی لـه سه‌رتاسـه‌ری کوردسـتاندا[١٣٢]. سـۆن، به‌رنامه‌یـه‌کی بـۆ ئاوه‌دانکردنـه‌وه‌و پـێش‌خستنی ناوچه‌ی سلێمانی داڕشت که ئه‌م قه‌زاو ناحیانـه‌ی ئه‌گرتـه‌وه: سه‌رچنارو تانجـه‌رۆو قـه‌ره‌داغ‌و سـورداش‌و سرۆچـك‌و زاب (شـوان)و سـه‌نگاوو هه‌ڵه‌بجـه‌و پێنجـوێن‌و شـارباژێڕو شـیوه‌که‌ڵ‌و قـامیش‌و چه‌مـچه‌ماڵ‌و بازیان‌و خورماڵ‌و هۆرێن- شێخان‌و ڕانیه‌و خه‌له‌کان-چناران‌و قه‌ڵادزێ‌و مه‌رگه‌و ناوده‌شت[١٣٣]. ڕێگاکانی ده‌ره‌وه بۆ سوورداش‌و هه‌ڵه‌بجه‌و کفری چاك کران" دوو پرد بۆ ئه‌وه‌ی هه‌ڵه‌بجه له‌سه‌ر تانجه‌رۆ کرا، پردێکی پێنج

---

[١٣٠] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص١٧٠، ١٧٢.

[١٣١] كرد وترك وعرب، ص٧٩.

[١٣٢] هه‌مان سه‌رچاوه، ل٥٣.

[١٣٣] سیروان به‌کرسامی‌و عه‌لی ناجی کاکه‌حه‌مه ئه‌مین عه‌تار، پێشکه‌وتن یه‌که‌مین ڕۆژنامه‌ی سلێمانی ١٩٢٠-١٩٢٢، هه‌ولێر، ١٩٩٨، ل١٥٠، ١٥٨، ١٦٢، ١٦٦.

تاقیش بۆ هی کفری بە خشت هەڵبەسترا. جادەکانی ناوشاریش دەستیان پێدا هێنرا[١٣٤].

بینباشی (موقەددەم) ڕەزا بەگی ئیسماعیل بەگ، لەبەر خزمەتی دڵسۆزانە، جەنەڕاڵ سێر جۆرج ماکمۆن شمشێری شەرەفی پێ بەخشی؛ کرا بە یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی لە شارباژێر کە ئەوسا (سیتەك) ناوەندی بوو، پاشانیش بە یەکەم قایمقامی قەزای شارباژێر لە (چوارتا)ی ناوەندی تازەیدا[١٣٥]. تۆفیق وەهبی کە هەر دوابەدوای شەڕی دەربەندی بازیان گەڕایەوە بۆ سلێمانی، لەبری نەقیب ڕ. ی. بارکەر، بوو بە یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی لە ڕانیە[١٣٦]، دواییش بە فەرماندەی هێزی لیڤی لە سلێمانی[١٣٧]. غەفوور ئاغای حاجی ئەولای گەورە بە سەرۆکی شارەوانیی سلێمانی دانرا[١٣٨]. ساڵی دواییش، مەحموود ئەفەندیی قادرئاغا، پاش مردنی عەبدوڵڵا بەگی یاوەر، لە جێی ئەو بە سەرۆکی تازەی شارەوانی هەڵبژێردرا[١٣٩].

سلێمانی ئەم سەروبەندە، جگە لە قوتابخانەی سەرەتاییی (نموونەی سەعادەت) کە ڕەشید زەکی کابان بەڕێوەبەری بوو، (نموونەی عیرفان)یشی وەك قوتابخانەیەکی ئەووەلی چوار پۆلیی تێدا کرایەوە لە خانووی حاجی

---

[١٣٤] هەمان سەرچاوە، ل٤٣، ٢٣٣-٢٣٤.

[١٣٥] کرد وترك وعرب، ص٩٩.

[١٣٦] هەمان سەرچاوە، ل٨١.

[١٣٧] رفیق حلمی، یادداشت، چ٢، بەشی یەکەم / ب٣، ل٣٢.

[١٣٨] کرد وترك وعرب، ص٨٣.

[١٣٩] پێشکەوتن، ل١٨٩-١٩٠.

ئەحمەد جادر لە گەڕەکی دەرگەزێن، سەعید زەکی فەتاح کرایە بەڕێوەبەری[١٤٠].
کاپتن هۆڵتی یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە یەکەمیاندا دەرسی ئینگلیزیی ئەوتەوە[١٤١].

کاربەدەستانی ئینگلیز هەر دوای دوورخرانەوەی شێخ مەحموود، بۆ هەم پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە کە ناوو دەسەڵاتی شێخ بەجێیان هێشتبوو، هەم دڵدانەوەی خەڵک و زیاتر کۆنتڕۆڵکردنی هەرێمەکە، کە هەلومەرجەکەیش لێی چاوەڕوان ئەکرا بەرەو گرژیو ئاڵۆزی بچێ، بیریان لەوە کردەوە یەکێکی تر بخەنە شوێنی. حەمدی بەگی کوڕی محەمەدڕەشید پاشای خدێو کوڕی سلێمان پاشای بابان[١٤٢]، لەو گەورەپیاوە ناسراوانەی کورد بوو کە بە شیاوی ئەو پلەوپایەیە زانرا. هەتا سەفەرێکیشی، زیاتر ڕێی تێئەچێ کانوونی دووەمی ١٩٢٠و کەمتریش لە کانوونی یەکەمی ١٩١٩دا بووبێ، بۆ ڕێک خرا بۆ کوردستان؛ هاتە سلێمانی، سەری لە ناوچەی پشدەر داو گەڕایەوە بۆ بەغدا[١٤٣]. کە گەڕایەوە، ئەم نامەیەی بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز نووسی:

---

[١٤٠] هەمان سەرچاوە، ل١١٤، ٢٤٠.

[١٤١] یادداشت، بەشی دووەم، ب٥، ل٧١.

[١٤٢] بۆ ژیاننامەکەی، بڕوانە: میر بصري، اعلام الكرد، رياض الريس للكتب والنشر– لندن– قبرص، ١٩٩١، ص١٩٥–١٩٦.

[١٤٣] بەپێی ئەو نامەیە کە ڕۆژی ٢٥ کانوونی دووەمی ١٩٢٠، دوای سەفەرەکەی، بۆ ن. ب. فولەری نووسیوە، ئەبێ کەموزۆر ئەو مانگە یا مانگی پێشووتر چووبێتە سلێمانی. لەگەڵ ئەوەیشدا، نامەی سەبارەت بە سەفەرێکی وا گرنگ، زیاتر ڕێی تێئەچێ گەرماوگەرمو هاوزەمان (واتە کانوونی دووەمی ١٩٢٠)

((بەڕێز

ڕووتان لێ ئەنێم سوپاسی بێپایانم قبوول بکەن، چونکە من قەرزاری چاکەی ئێوەم کە هەم یەکەم سەردانی ڕۆڵەکانی میشتمانەکەمتان بۆ ڕێك خستم و ئەفسەری سیاسیتان لە کوردستان یارمەتییەکی چاکی داون. هەروەها سوپاستان ئەکەم بۆ ئەو کۆمەکە مرۆدۆستانەیە کە لە ساتێکی شلۆقدا پێشکەشی کورد کرا، کاتێك سەدانیان ڕۆژانە بەدەست برسێتییەوە ئەیان نالاند. ئەوی ڕاستی بێ مایەی خۆشحاڵیمە کە ئەبینم گەلەکەم سەرلەنوێ و دوای ئەوەی لەو حوکمە خراپە ڕزگاری بوو، ئەبووژێتەوە. من دڵشادم، چونکە دەوڵەتە مەزنەکەتان کە ڕەنگە ببێتە سەرهەڵوێستی میزۆپۆتامیا، بایەخ بەو بەشەی کوردستان ئەدات کە کاروبارەکەیم بە شێوەیەکی تایبەت بەلاوە بایەخدارە. من قەناعەتم وایە کە یەکخستنی ئیدارەی پەیوەندیی نێوان کوردستان و میزۆپۆتامیا کلیلی گەشەکردنە. هیوامە زانیاریی فراوان و سامانی زۆر و زەبەند بە خێرایی گەلێکی تەندروست و دەوڵەمەندیان بۆ بەدی بێنێ)) [144].

بەلام دوای هەڵسەنگاندن و لێوردبوونەوە، لەو پۆستەدا دانەنرا. ئەگەرچی مونەووەران و سەرانی ناوچەی سلێمانی ڕێکخراوێکیان بە ناوی (کۆمەڵی سەربەخۆیی کوردستان)ـەوە (١٩١٩-١٩٢٠) پێك هێنا بۆ

---

نووسرابێ (الدکتور احمد عثمان ابوبکر، کردستان في عهد السلام، القسم الثالث والعشرون، "الثقافة"، العدد ١، کانون الثاني ١٩٨٣، ص٥٨-٦٧).

[144] الدکتور احمد عثمان ابوبکر، کردستان في عهد السلام، "الثقافة"، العدد١، کانون الثاني ١٩٨٣، ص٦٢-٦٣.

پشتیوانیی حەمدی بەگی بابان و زەمینە خۆشکردن بۆ بوونی بە حوکمداری کوردستانی جنووبی، بەڵام کۆمەڵەکە، لەبەر بێدەنگیی حەمدی بەگ و جێبەجێنەبوونی ئەو پرۆژەی جێگرتنەوەیە، پووکایەوە[145]. سەرباری ئەوە، چەند دەستەو کۆمەڵێکی نەیار بە نهێنی خەریکی خۆڕێکخستن و بەیاننامە بڵاوکردنەوەو چالاکیی سیاسی بوون دژ بە ئینگلیز[146].

سەرخێڵانی هەمەوەندو زەنگەنەو ڕۆغزاییی و مکایەڵی و ڕەباتی و ئالیوەیی و شێخانی قەرەداغ، لە بەهاری ١٩٢٠دا لە (ژاڵە)ی لای دێی (کرپچنە) کۆبوونەوە، بڕیاریان دا ئینگلیز تەنگەتاو بکەن و بەرەنگاری ببنەوە، تا ناچاری هێنانەوەی شێخ مەحموود بێ. هەتا چەند شەڕێکیشیان لە ناوچەی چەمچەماڵ و خوارووی کرپچنە کرد[147]. ئەو شەڕانە، لەپاڵ چالاکیی تری ئێرەو ئەوێدا، بوونە هێزێکی گوشاری کارا.

---

[145] یادداشت، چ٢، بەشی دووەم/ ب٤، ل١٠٩-١١٩.

لەبەر ئەوەی ڕەفیق حیلمی دواتر لە ساڵانی سیدا ئەو بیرەوەریانەی نووسیوەتەوە، ئەبێ دەستکاریی ناوی ڕاستی ئەو کۆمەڵەیەی کردبێ، چونکە هەردوو زاراوەی (کۆمەڵ) و (سەربەخۆیی) ئەوسا ئەوەندە نەکەوتبوونە ناو ئەدەبیاتی سیاسیی و ڕۆژنامەوانیی کوردییەوە، (جەمعییەت) و (ئیستیقلال) لەبرییان بەکار ئەهێنرا، وەك ئەوە لە ناوەکانی (جەمعییەتی کوردستان-١٩٢٢) و ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال ١٩٢٣-١٩٢٤)دا دەرکەوتووە.

[146] چیم دی، ب١، ل٦١-٦٤.

[147] عبدالرقیب یوسف، لە کەلەپووری بەڵگەنامەیی کوردی/١، "ڕۆشنبیری نوێ" (گۆڤار)، ژ١١٠، ١٩٨٦، ل٧٤.

ئەنجومەنی ئیدارەی شار، ڕۆژی ١٧/٤/١٩٢٠، ئەمانەی بۆ هەڵبژێردرا: حاکمی سیاسی سەرۆك، بینباشی عەبدوڵلا بەگی یاوەرو تۆفیق وەهبی و میرزا فەرەجی حاجی شەریف و حاجی برایم ئاغای خەفاف و خواجە یونتۆب ئەندامان. تۆفیق وەهبی، ئەودەمە فەرماندەی هێزی لیڤی بوو[148].

سۆن چاپخانەیەکی هێنایە سلێمانی، چەند کەسێکی فێری چاپ کرد: شێخ عەبدولمەجیدی شێخ عارف، شێخ محەمەد تەییبی برای، محەمەدئەدیب عەزیزو محەمەد تۆفیق[149].

ئەو چاپخانەیە، جگە لە ئەوراقی پێویستی دائیرەکان، ڕۆژنامەی "پێشکەوتن"ی بۆ یەکەمین جار لە مێژووی سلێمانیدا پێ لەچاپ درا کە یەکەم ژمارەی ڕۆژی ٢٩/٤/١٩٢٠ لێ دەرچوو.

ناوچەکانی کوردستانی جنووبی، ئەم سەردەمە، کەموزۆر پشێوییان تێکەوت. کاپتن بێلی حاکمی سیاسیی ئامێدی و کاپتن ماکدۆناڵدی بەڕێوەبەری پۆلیس ڕۆژی ١٥/٧/١٩١٩، ساپ و ترووپ دوو مانگ دواتر لە ناوچەی ئامێدی کوژران[150].

---

[148] پێشکەوتن، ل٤٨.

[149] احمد خواجە، چیم دی، ب٢، سلێمانی، ١٩٦٩، ل٤٩، ٥٠، ٥٢؛ د. کەمال مەزهەر، چەکێك لە مێژووی یەکەم چاپخانەی کوردی لە شاری سلێمانی، "ڕۆشنبیری نوێ" (گۆڤار)، بەغدا، ژ٧٧، تشرینی یەکەمی ١٩٧٩.

[150] م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب٢، ل١٩٣.

کاپتن بێلی حاکمی سیاسیی مووسڵ و سکۆتی یاریدەدەری، ٤ی تشرینی دووەمی ١٩١٩، بە دەستی زێباری و بارزانییەکان لای دێی پیرەکەپرە لەسەر ڕێگەی ئاکرێ کوژران[١٥١]. ئیبرایم خانی دەلۆ ڕۆژی ١٩٢٠/٨/٢٢ شاری کفریی گرت، کاپتن سالمۆندی حاکمی سیاسیی دەستگیر کردو ئەنجومەنێکی بۆ بەڕێوەبردنی شار پێك هێنا. بەردانی سالمۆند بەسترایەوە بە هێنانەوەی شێخ لە ئەسارەت. هێزەکانی ئینگلیز، دوای هەوڵێکی زۆر، لە ٩/١٠ دا ئەمجا کفرییان بۆ گیرایەوە[١٥٢].

کۆنگرەی لەندەن، شوباتی ١٩٢٠ لەلایەن گەورە دەوڵەتانی هاوپەیمانەوە بەسترا؛ یەکێ لە بابەتە قسەلێکراوەکانی مەسەلەی ویلایەتی مووسڵ (کوردستانی جنووبی) بوو، وەك کێشەیەکی کراوە هێڵرایەوە[١٥٣]. کۆنگرەی سان ڕیمۆیش نیسانی ئەوساڵە لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە سازکرا. هەرسێ دەوڵەتی بریتانیاو فەرەنسەو ئیتاڵیا، ڕۆژی ١٩٢٠/٤/٢٣، پرۆژەی ڕێککەوتنێکی سێقوڵییان سەبارەت بە کوردستان ئیمزا کرد[١٥٤].

---

[١٥١] المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، ص٢٢٦.

[١٥٢] مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، بغداد، ١٩٨٥، ل١٣٢-١٣٤، ١٤٠-١٤١، ١٥٠.

[١٥٣] الدكتور احمد عثمان ابو بكر، كردستان في عهد السلام، القسم الثامن، "الثقافة"، العدد٧، تموز ١٩٨٠، ص٤٥-٥٤.

[١٥٤] المصدر نفسه، القسم التاسع، "الثقافة"، العدد ٨، آب ١٩٨٠، ص٣٤-٤٦، والقسم العاشر، العدد ٩، إيلول ١٩٨٠، ص٩٢-١٠٣.

پەیمانی سیڤەر ١٩٢٠/٨/١٠ لەنێوان هاوپەیمانانو دەوڵەتی عوسمانیدا مۆرکرا، بەوپێیە لە سێ بەندی (٦٢، ٦٣، ٦٤)یدا بڕیار درا پلانێکی ئۆتۆنۆمی، لە ماوەی شەش مانگی جێبەجێکردنی پەیمانەکەدا، بۆ ناوچە کوردنشینەکانی نێوان ڕۆژهەڵاتی فوراتو باشووری سنووری خوارووی ئەرمینیاو باکووری سنووری تورکیا- سووریاو تورکیا- عیراق دابنرێ. ئەگەر کوردی ئەو ناوچانە، لە ماوەی ساڵێکی بەجێهێنانی پەیمانەکەدا، داوای لە ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان کرد سەربەخۆ بێو لە تورکیا جیاببێتەوە، گەر ئەنجومەن زانیی شیاوی ئەو جۆرە سەربەخۆییەیە، ئەیداتێ. هاوپەیمانان لەم حاڵەتەدا لارییان لەوە نابێ کە کورد بچێتە پاڵ دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆی پێکهاتوو لە کوردی دانیشتووی ئەو بەشەی کوردستان کە تا ئەوکاتە لەناو ویلایەتی مووسڵدا بوو[١٠٠].

ڕەواندز، لە ١٩٢٠/٨/٣٠ بەدواوە کە هێزەکانی ئینگلیز بە تەنگ پێهەڵچنینی نووری باویل ئاغاو باوکیو خدر ئاغای حەمەدەشینی سەرچیاو شێخ کاکەمینی سەلان (سەران)و شێخانی بجێلو عەشیرەتی سوورچیو خدر ئاغای کۆڕێو خەڵکی ناوچەکە چۆڵیان کرد، بوو بە بنکەی بەرهەڵستانو ئەو هێزانەی تێچوون. غەفوورخانی ناودەشتیش چووە پاڵیان[١٠٦]. ئەوانە کەوتنە هەوڵدان بۆ پەیداکردنی پشتیوانو هێنانی هێزی تورك بۆ ناوچەکە. تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ ئەحمەد تەقی

---

[١٠٠] الدكتور فاضل حسين، مشكلة الموصل، ط٢، مطبعة السعد-بغداد، ١٩٦٧، ص١٣.

[١٠٦] دبليو. آر. هي، سنتان في كردستان ١٩١٨-١٩٢٠، ترجمة فؤاد جميل، ج٢، بغداد، ١٩٧٣، ص١٣٢-١٣٥؛ یادداشت، ب٦، ل١٤-١٥.

وەك نوێنەری بەرهەڵستانی ناوچەی ڕەواندزو پشدەرو ڕانیە، بە یاوەریی فەتاحی شانەگەرو حەمید ناوی پیاوی شێخ ئەمین، چووە (وان)[157].

یەکەم حکوومەتی کاتیی عیراق ٢٥/١٠/١٩٢٠ بە سەرۆکایەتیی عەبدوڕڕەحمان ئەننەقیب دامەزرا، تا ٢٣/٨/١٩٢١ مایەوە[158]. ئەنجومەنی وەزیرانی ئەو حکوومەتە ١٠/١١/١٩٢٠ بە ڕەزامەندیی کاربەدەستانی ئینگلیز، بڕیاری دا چەند کەسێکی دوورخراوە بۆ دوورگەی (هەنگام) بهێنرێتەوە بۆ عیراق[159]. ئەوە شێخی گەورەی نەگرتەوە.

ماڵو منداڵوخزمو دۆستو لایەنگرانی شێخ کە دوای شەڕی دەربەندی بازیان ئاوارەی دیوی کوردستانی ئێران بوون، چوونە سەقزو ورمێو ناو مەنگوڕ، پاشان نەهریو کۆنەشارو چاریەی کوردستانی تورکیا لای سمکۆ[160].

ئەوانە، کەموزۆر و بەتایبەت ماڵو کەسوکاری شێخ، یەکەم نیوەی ساڵی ١٩٢١، دوای ئەوەی لێبوردنی حاکمی سیاسییان بۆ وەرگیرا، گەڕانەوە بۆ سلێمانی، ماڵو منداڵی شێخ ڕێی درا لە (داریکەلی) دابنیشێ[161]؛ لەوانە شێخ قادری حەفید کە لە شاری سەقز گیراو تەسلیمی بەغدا کرایەوە،

---

[157] بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی، ل٢٦.

[158] عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط٥، ج١، بيروت، ١٩٧٨، ص٨.

[159] هەمان سەرچاوە، ل٢٣.

[160] کەمال نوری مەعرووف، یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل٦٦-٧٧.

[161] هەمان سەرچاوە، ل٧٥.

ئەو مێژووە، بەپێی گێڕانەوەی ناو یادداشتەکە، بە مەزەندە دیاری کراوە.

١٤ی حوزەیرانی ١٩٢٠، گوایە لەگەڵ تۆفیق قادرو محەمەد فەتاحدا، ڕەوانەی بەسرە کرا بە نیازی ناردنە هیندستان[١٦٢]، مایس و حوزەیرانی ١٩٢١، هەر لە بەغدا بوو[١٦٣].

ئەو دەورانە، "سەید تەهای نەهری"ش یەکێکی تر بوو لەو سەرکردە کوردانە کە خرایە بەر قسەو هەڵسەنگاندن بۆ دانانی بە حوکمداری ناوچەی سلێمانی و ڕەواندز لەبری شێخی گەورە. بەڵام دواجار بە کەسێکی تواناو گونجاو بۆ ئەو مەبەستە نەزانرا[١٦٤].

١٩٢١/٢/١٢ کۆنفرانسێك، بە ئامادەبوونی نوێنەرانی ئینگلیزو تورکانی کەمالی لە لەندەن بەسترا. کارەکانی سەری نەگرت، چونکە تورکەکان قایل نەبوون پەیمانی سیڤەر ببێتە بناغەی بابەتی دانوستانی نێوان هەردوولا[١٦٥].

١٢ی مارتی ١٩٢١یش کۆنگرەی قاهیرە سازدرا، کە دوانزە ڕۆژی خایاندو چل تا پەنجا دانیشتنی لەوپەڕی نهێنگریدا لە (ئوتێلی سەمیرئەمیس)ی قاهیرە بۆ کرا، لەبەر ئەوە کورد دوای ماوەیەکی درێژ ئەمجا ئاگاداری باس‌وخواسەکانی بوون سەبارەت بە پاشەڕۆژی کوردستان. بەڵام ئەزانرا کێشەی کورد یەکێك بوو لەو دوو گرنگترین

---

[١٦٢] پێشکەوتن، ل٧٨.

[١٦٣] هەمان سەرچاوە، ل٣٠٢.

[١٦٤] محمد رسول هاوار، سمکۆ (ئیسماعیل خانی شوکاك)و بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، چاپخانەی ئاپێك-سوید، ١٩٩٦، ل٣٢٧-٣٢٨.

[١٦٥] يقظة الكرد، ص٣٦٥.

مەسەلانە کە لەبارەی عیراقەوە خرانە بەرچاو[166]. چەرچەڵی وەزیری کۆلۆنیەکان و سێر پێرسی کۆکسی مەندووبی سامی و مێجەر یۆنگ و مێجەر نۆئێل و جەعفەر عەسکەری و جەنەراڵ هاڵدنی فەرماندەی گشتی ی هێزی بریتانیا لە میزۆپۆتامیاو ساسۆن حسقێل ئامادەی بوون.

دائیرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست یاداشتێکی دایە لیژنەی سیاسی کە ئەمەی تێدا هاتووە: ((بیروڕای بەهێزمان ئەوەیە، ناوچەکانی کوردی ی تەواو ڕەسەن نابێ بخرێنە ناوئەو دەوڵەتە عەرەبییە کە لە میزۆپۆتامیا دائەمەزرێنرێ، بەڵکوو ئەبێ حکوومەتی خاوەن شکۆ ئەوەندەی بتوانێ هانی پرنسیپی یەکگرتنی کورد بدات و چاودێری ی ناسنامەی نەتەوەیی بکات. درێژکراوەی ئەو ناوچەیە کە دەرفەت و توانایی بۆ حکوومەتی خاوەن شکۆ ئەڕەخسێنێ لەسەر ئەم سیاسەتە بەردەوام بێ، بە حوکمی ناچاری پشت بە مەرجەکانی یەکجارەکی بەلاداخستنێکی ئاشتییانەی کێشەکە لەگەڵ تورکیادا ئەبەستێ. ئەم ناوچەیە ڕووبەرەکەی بگاتە هەرچەندێك، ئەگەر جۆرە نیزامێکی کوردی ی ناوەندی هەبێ، کۆنترۆڵی حکوومەتی خاوەن شکۆ ئاسان ئەکات ڕاوێژکارێکی ئینگلیزی بخرێتە تەك" بە مەرجێك ئەو ڕاوێژکارە بەسترابێتەوە

---

[166] هەمان سەرچاوە، ل٢٣٦.
بەهەشتی جەرجیس فەتحوڵڵا لە کتێبەکەیدا (یقظة الکرد، ص٢٤١، ٢٤٢) ئاماژەی بەوە داوە کە مێژوونووسانی عەرەبی لە وێنەی عەبدوڕڕەزاق حەسەنی و فازڵ حسێن و محەمەد تاهیر ئەلعومەری و ڕۆژنامەوانی ی عەرەبی ی عیراقی سەردەمەکەیش بە مەبەستەوە هەوڵیان داوە زانیاریەکانی تایبەت بە کوردی ئەو کۆنگرەیە بشارنەوە و هیچی لەبارەوە نەدرکێنن.

بە مەندووبی سامی لە میزۆپۆتامیا، لە ڕێی ئەویشەوە پەیوەندیی بە حکوومەتی خاوەن شکۆوە ئەبێ[167])).

چەرچەڵ ئۆتۆنۆمییەکی تەواوی بۆ کوردستانی جنووبی پێ باشتر بوو، تا دەوڵەتێکی لەمپەر لەنێوان گوشاری تورکیا لە دەرەوەو هەر جووڵانەوەیەکی دژی بریتانیادا لە ناوەوە دروست بکات. هاوڕای نۆئێل و یۆنگیش بوو کە ئەو ڕۆژانە بە جەختکردنەوە وتوویانە: ((ئێمە نەك هەر پشتگیریی ئەلکاندنی ناوچە تەواو کوردنشینەکان بە دەوڵەتی عەرەبیی میزۆپۆتامیاوە ئەکەین، بەڵکە پێویستە حکوومەتی خاوەن شکۆ تا پێی بکرێ برەو بە بنەماکانی یەکبوونی کوردو نەتەوایەتی بدات)). چەرچەڵ، لەم بارەیەوە وتوویە: حکوومەتی پاشەڕۆژی عیراق و سوپای عیراق: ((هیواو ئاواتەکانی کورد فەرامۆش ئەکات و وەك کەمایەتی ئەیچەوسێنێتەوە ... ئەگەر کورد دەرفەتی بۆ ئەرەخسێ خۆی حوکمی خۆی بکات و بەو دەوڵەتە تازەیەوە لکێنرا، ئەوسا هەر میرێکی بنەماڵەی شەریفی مەککە، هەرچەندە دیموکراتی بێ و گیانی بێلایەنیی هەبێ، هەر کە خۆی لە جێ ورێیەکی بەهێزدا بینییەوە، دوور نییە ببێتە ڕێگر لەبەردەم بەرژەوەندو ئاواتە نەتەوەییەکانی کورددا وەك کەمایەتییەکی ئیتنی. لەبەر ئەوە تاکە ڕێگەیەك بەرژەوەندی بریتانیای تێدا پارێزراو بێ، دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی لەمپەرە لەنێوان تورکیاو عیراقدا[168].

---

[167] يقظة الكرد، ص٢٣٧.

[168] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە؛ دافيد كورن، رجلان أقحما الاكراد بالعراق: مناورات كوكس- ولسون/ ٣-٤، "الاتحاد"، العدد ٣٢٥، ١٩٩٩/٧/٢.

کۆکس لە کۆبوونەوەی لیژنەکەدا ڕۆژی ٣/١٥ وتی: کورد زۆرینەی ناوچەکانی کەرکووک و سلێمانی و باکووری ویلایەتی مووسڵ، کە بەشێکی جیانەکراوەی عیراقە، پێك ئەهێنن. هێربەرت یۆنگ ڕەخنەی لێ گرت و پێشنیاری کرد دەستبەجێ و بەبێ دواخستن دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنرێ و بخرێتە سایەی چاودێریی ڕاستەوخۆی مەندووبی سامییەوە، نەك بکرێتە پارچەیەکی عیراق یا ناو چوارچێوەی بەرپرسیی حکوومەتەکەی کۆکس. نۆئێلیش پشتگیریی کرد.

لیژنە کۆبوونەوەی خۆی بە ڕەچاوکردنی ڕاسپاردەی یۆنگ کۆتایی پێ هێنا، بەوەی کە کوردستانی جنووبی نەخرێتە سەر عیراق. هەریەکە لە چەرچەڵ و نۆئێل و لۆرەنس کە زۆربە بوون، پشتیوانییان لەم پێشنیارە کرد، پێرسی کۆکس و گێرتروود بێڵیش دژی بوون. بەڵام زۆرینە لەسەر ئەوە پێك هاتن کە ئەم بڕیارە تا دوای سێ ساڵی تر کاری پێ نەکرێ، تا کورد نوێنەرایەتییەکی بۆ ساز ئەبێ، کە ڕەنگە حەز بە چوونەپاڵ عیراق بکات یا نەیکات[١٦٩].

کۆکس لە ١٩٢١/٥/٦دا یەکەم هەنگاوی بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی قاهیرە، ئەم بەیاننامەیە بوو وەك کارنامە بۆ ئەفسەرانی سیاسی لە مووسڵ و کەرکووک و سلێمانی و هەولێر:

((مەندووبی سامی شێلگیرانە و بەکردەوە ئەڕوانێتە ڕێوشوێنەکانی پێویستی بەڕێوەبردنی ناوچە کوردنشینەکان لە عیراق. ترس هەیە

---

[١٦٩] یقظة الکرد، ص٢٣٨.

بلکێنرێ بە حکوومەتی بەغداوە، بۆیە هەندێکیان داوای سەربەخۆیی ئەکەن. هاوکات سەرانی ڕای گشتیی کورد هەست بە بایەخی زۆری پەیوەندیەکانی ئابووریی و پیشەسازی ئەکەن کە بە عیراقیانەوە ئەبەستێ. لەم کاتەدا مەندووبی سامی پێویستیی بە زانیاری هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستەڕێی خواستەکانی کورد. ئەگەر بیانەوێ لە چوارچێوەی عیراقدا بمێننەوە، ئامادەیە پێشنیاری ئەم چارەسەرانەی لای خوارەوە بۆ حکوومەتی عیراق بکات:

١- ناوچە کوردنشینەکانی لیوای مووسڵ و سایەی ئینتیدابی بریتانیا، لیوایەکی لاوەکی پێك دێنێ لە قەزاکانی زاخۆو ئاکرێ و دهۆك و ئامێدیی و ناوەندەکەی دهۆك ئەبێ؛ یاریدەدەرێکی موتەسەریفی ئینگلیز بە هاوکاریی چەند قایمقامێکی ئینگلیز بەڕێوەی ئەبات، وا کە کورد یا عەرەبی کوردیزان بخرێتە شوێنیان و کورد لێیان ڕازی بێ. ئەم لیوا لاوەکیە لە کاروبارەکانی داراییی و قەزاییی خۆیدا ملکەچی حکوومەتی نیشتمانیی بەغدایە. پێبەپێ نوێنەرانی خۆیشی ئەنێرێ بۆ مەجلیسی دامەزراندن (المجلس التأسيسي). بەڵام بۆ مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە ئیدارەی گشتییەوە، ئەوە قایمقامەکان ئەچنەوە لای موتەسەریفە ئینگلیزەکەیان. دامەزراندنیش لە ئیدارەدا، مەندووبی سامی بە ڕاوێژپێکردنی حکوومەتی خۆجێیی ئەیگرێتە ئەستۆ.

٢- مەندووبی سامی ڕێوشوێن بۆ مەسەلەی بەشداریپێکردنی ئەفسەرانی سیاسیی ئینگلیز لە بەڕێوەبردنی هەولێرو کۆیەو ڕەواندزدا دائەنێ و ئەبێ پابەندی ڕەچاوکردنی ئارەزووی خەڵکەکەیان بن لە

دامەزراندنی فەرمانبەرانی حکوومەتدا. هەر کاتێ هەلومەرج ڕەخسا وردەکاریی ئەوەیش دائەڕێژرێ.

٣- سلێمانی وەك موتەسەرپفیەتێك مامەڵەی لەگەڵدا ئەکرێ، موتەسەرپفێك بەڕێوەی ئەبات و ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاریی ناوچەیی یاریدەی ئەدات. مەندووبی سامی ڕاوێژکارێکی ئینگلیزی بۆ دەست نیشان ئەکات و ئەیخاتە تەکی؛ تا ئەوددەمەی وا ئەم موتەسەرپفە دائەمەزرێنرێ، ئەفسەری سیاسی لە جێی ئەو ئەبێ. ئەم موتەسەرپفەیش مەندووبی سامی تا چ ڕادەیەك بە پێویستی بزانێ، دوای ڕاوێژکردن بە خۆی و حکوومەتی بەغدا، دەسەڵاتی ئەداتێ. قایمقامەکانی حاڵی حازر ئەبێ ئینگلیز بن، بە مەرجێك کە کوردی لێوەشاوە پەیدا بوون بخرێنە شوێنیان)). ئەم بەیاننامەیە، بە بۆچوونی جەرجیس فەتحوڵڵا، سەرەتای لادان بوو لە بڕیارەکانی کۆنگرەی قاهیرە[١٧٠].

بە گەیشتنی مەفرەزەیەکی تری تورك، بە فەرمانداریی یووزباشی مەحموود فازڵ، تەشکیلاتێکی مەجلیسی میللی لەمانە ڕێك خرا:

١-شێخ ڕەقیبی سوورچی- ڕەئیسی مەجلیس،

٢-ئەحمەد تەقی- جێگری ڕەئیس،

٣-باویل ئاغا و غەفوورخانی ناودەشت و سەعید بەگ و شێخ جواد "شێخ عەبدوڕڕەحمانی سەران" و سالح بەگ و شێخ کاکەمینی سەڵان- ئەندامانی مەجلیس،

٤-مگۆك "ئەحمەد بەگ"- قایمقامی ڕەواندز،

---

[١٧٠] هەمان سەرچاوە، ل٢٣٨-٢٤٠.

٥-نووری باویل ئاغا- ڕەئیسی جەندرمە،
٦-شەوکەت ئەفەندی- ڕەئیسی بەلەدییە،
٧-مستەفا ئەفەندیی ڕەواندزی- مودیرماڵ[١٧١].

شێخ مەحموود، بەپێی ڕاپۆرتێکی نۆئێل، مارتی ١٩٢١ لە دوورگەی (هەنگام)ی نزیکی تەنگەلانی هورموز بووە[١٧٢]. ڕەنگە سەرەتای ئەوساڵە، یا کۆتایی‌ی ساڵی پێشوو لە (ئەندامان)ـەوە هێنرابێتە ئەوێ. مێجەر سۆنیش ڕۆژی ١٩٢١/٣/٥ سلێمانیی بە مۆڵەتی شەش مانگ بەجێهێشت. پێئەچێ ئەو ڕۆیشتنەی سۆن، لەبەر گۆڕانی بۆچوونی ئەو دواییەی بووبێ، کە لەگەڵ هی مەندووبی سامیدا جووت نەهاتووەتەوە، چونکە ئەوتری: لە ١٩٢١ـەوە داوای لە بریتانیا کردووە دەوڵەتێکی کوردی لە سایەی خۆیدا دابمەزرێنێ. سۆن باوەڕی بە مافی چارەی خۆنووسینی کورد هەبوو، بۆیە کوردی کردە بەشداری ئیدارەی خۆجێیی و فێری ئوسووڵی حوکمی ئەکردن[١٧٣].

کۆکس لە نامەیەکدا بۆ چەرچڵ بۆی نووسی، ئەوەی لە دەقی ماددەی ٦٤ی پەیمانی سیڤەر هەڵهێنجاوە کە پێویستە درێژە بە بەڕێوەبردنی

---

[١٧١] بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی، ل٣٤؛ یادداشت، ب٦، ل٢١-٢٢.

[١٧٢] م.ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب١، ل٤٦٤.

[١٧٣] يقظة الكرد، ص٢٢٨؛ اي، إم. هاملتون، طريق في كردستان، ترجمة جرجيس فتح الله، مطبعة دار الجاحظ- بغداد، ١٩٧٣، ١٥٦؛ دافید کورن، هەمان سەرچاوە، /٣-٤، "الاتحاد"، العدد ٣٢٥، ١٩٩٩/٧/٢؛ دراسة تحليلية لمستقبل كردستان السياسي/١، "الاتحاد"، العدد ٤٣١، ٢٠٠١/٧/٢٧.

ناوچە کوردیەکان بدات. وەزارەتی کۆلۆنیەکانیشی ئاگادار کردەوە کە کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ شارەزایانی کورددا کردووە؛ بە کۆی دەنگ بڕیار دراوە کە چاکترین چارەسەر هەموو بیروڕاکانی تێدا لەبەرچاو بگیرێ ئەوەیە کە کوردستان، لەبەر مەبەستی دارایی و بودجە، وەك بەشێکی لەجیابوونەوەنەهاتووی عیراق بمێنێتەوە. هەرچی مەسەلەی ئۆتۆنۆمیشە، ئەوە مەندووبی سامی ڕاستەوخۆ وەك ئۆتۆنۆمییەکی خۆجێیی لەڕێی چەند فەرمانبەرێکی کوردو ئینگلیزەوە سەرپەرشتیی بکات.

چەرچەڵ بە برووسکەی ژمارە ۲۰۱ی ڕۆژی ۵/۲۱ وەڵامی دایەوە: ((کە قاهیرەم بەجێهێشت بۆچوونێکی جیاوازم لەسەر بەرامبەر یەکتر ڕاگرتنی بیروڕاکانی تایبەت بە سیاسەتی کوردی لەلا دروست بوو. پێم وایە ئێوە ئەو بەشەی میزۆتامیا کە ئەبێ ڕاستەوخۆ بەڕێوە ببرێ، جا لە کۆتاییدا هەر چارەنووسێکی هەبێ، لەو بەشە جیائەکەنەوە کە دواجار ئەخرێتەپاڵ عیراق)). دیسان بە برووسکەی ڕۆژی ۵/۲۵ی خۆی بیری کۆکسی هێنایەوەو ڕایسپارد کەرکووك نەخاتە ناو عیراق. ڕایەکەی پێشووی جەخت کردەوە کە مێشکیی پڕکردبوو: ((دەوڵەتێکی کوردیی لەمپەر لەرووی ئەتنییەوە لە خەڵکانی غەیرە عەرەب پێك بهێنرێ)). ئەمجا ڕێنوێنیی و فەرمانەکانی خۆی دەرکرد بۆ دائیرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە پێویستە پشت بەستوو بە بڕیاری کۆنگرەی قاهیرە مێجەر نۆئێل و شێخ مەحموود بگەڕێنرێنەوە بۆ کوردستان[١٧٤].

---

[١٧٤] يقظة الكرد، ص٢٤٠، ٢٤١، ٢٤٢.

ئیتر گۆلد سمیث لە یەکی مارتەوە بوو بە حاکمی سیاسی[175].
مەندووبی سامی ڕۆژی ١٩٢١/٥/٣٠، بە فەرمانی شای بریتانیا، لێبوردنی گشتیی بۆ تاوانبارانی تا تشرینی ١٩٢٠ دەرکرد، وا لە ٣٠ی مایسەوە بەربدرێن و بهێنرێنەوە[176]. دیسان شێخی نەمری نەگرتەوە.

هاوزەمان مەندووبی سامی بە حاکمی سیاسی‌ی ئینگلیزی لە سلێمانی ڕاگەیاند کە ئەو ناوچەیە تا سێ ساڵی تر ناخرێتە ناو ئیدارەی عیراق، دوایی بیری خۆیان ئەنوێنن بۆ چوونە پاڵ حکوومەتی میللی‌ی بەغدا یان نا[177].

٦/٩ چەرچەڵ هاتەوە سەر ئەوەی پێ دابگرێ و بڵێ: پێویستە سوود لە خزمەتەکانی نۆئێل وەربگیرێ کە پەیوەندییان بە شێخی دوورخراوەی هیندستانەوە هەیە، بۆیە ئەبێ لە ٤/١١ بەدواوە بەربدرێ. بەڵام کۆکس بەئەنقەست خاوەخاوی تێدا کردو گوێی نەدایە بێزاری‌ی چەرچەڵ کە دەرکی پێ کردبوو مەندووبی سامی لەڕادەبەدەر بەرهەڵستی هێنانەوەی ئەو دوو پیاوەیە. کۆکس دوای دوو مانگ ئەمجا لە ٦/٨دا وەڵامی داواو پرسیارەکانی چەرچەڵی دایەوە؛ چەند بەهانەو پاساوێکی بەکارهێنا تا قەناعەت بە دائیرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکات کە پلانەکەی ڕاست و دروستە بۆ چارەسەری مەسەلەکانی ناوچەکە[178].

---

[175] پێشکەوتن، ل٢٢٥.
[176] تاریخ الوزارات العراقیة، ج١، ص٣٨-٣٩؛ پێشکەوتن، ل٢٧٤.
[177] پێشکەوتن، ل٢٧٨.
[178] یقظة الکرد، ص٢٤٣.

هەوڵەکانی کۆکس بەردەوام بوو. چەرچەڵیش هەر لەسەر بۆچوونی خۆی سوور بوو: ((ئەبێ حوکمی عەرەبی، بە دیاریکراوی تەنیا خاکی عەرەب بگرێتەوە)). بەڵام ئیتر کۆکس ئەیتوانی بڵێ زۆربەی کورد لە ٥/٦دا ڕاوێژی پێ کراوەو جیانەبوونەوەی هەڵبژاردووە، نابێ ئەو ئارەزوەیان فەرامۆش بکرێ. نەتەوەپەرستانی عەرەبیش وا ڕاهێنراون کە عیراق بە ویلایەتی مووسڵەوە دروست ئەکرێ؛ لەکاتێکدا نائومێدکردنیان ئەبێتە مایەی تەقینەوەیەکی توندی وەك ئەوەی ساڵی ١٩٢٠. ڕاپۆرتو نامەو برووسکەکان بەرودوا هاتن. بۆیە چەرچەڵ لە ١٩٢١/٦/٢٦دا کۆبوونەوەیەکی بە دائیرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کرد، بە نوێنەرانی هەموو وەزارەتە پەیوەندیدارەکانەوە. هەر کە مێجەر سۆنو ستیڤن لۆنگریکی یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی لە لیوای کەرکووك چووە پاڵیان، زۆربەی ڕاپۆرتو پێشنیارەکانی کۆکس ڕەت کرانەوە، لەبەر ئەوەی پێچەوانەی بڕیاری کۆنگرەی قاهیرە بوون. بەوپێیە، ڕێگەچارەی دووەم کە هاندانی ناوچەی کوردنشین بوو بۆ حوکمێکی سەربەخۆ، پەسند کرا، سۆنو نۆئێلیش قبووڵیان کرد. دائیرەی سیاسی لە وەڵامدا ئاماژەی بۆ ئەو جووتە کردووە: ((دائیرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێی وایە ڕاوێژکارانی کۆکس کەسی وەك سۆنو لۆنگریکیان تێدا نییە بتوانێ بە متمانە یا شارەزاییەکی لە وێنەی ئەواندا قسە بکات))[١٧٩].

فەیسەڵی کوڕی شەریف حسێن کە بۆ شای عیراق دەست نیشان کرابوو، ڕۆژی ١٩٢١/٦/٢٩ گەیشتە بەغدا. لەو دەنگدانە گشتییەدا کە لە

[١٧٩] هەمان سەرچاوە، ل٢٤٣-٢٤٤.

لیواکانی عیراقدا بۆی کرا بۆ باوەڕپێهێنانی وەك مەلیك، لیوای کەرکووك دژی فەیسەڵ دەنگی دا، سلێمانی بەشداریی تێدا نەکرد. هەولێرو مووسڵیش مەرجیان دەستەبەرکردنی مافی کەمەنەتەوەکان بوو بۆ دامەزراندنی ئەو ئیدارانە کە هاوپەیمانان لە پەیمانی سیڤەردا بەڵێنیان پێدابوون. فەیسەڵ ڕۆژی ١٩٢١/٨/٢٣ تاجی شاهانەی لەسەر نرا[١٨٠].

کە فەیسەڵ کرایە مەلیك، سەرنج درا دەوڵەتە تازەکە لە ٧٩٪ی شیعەی عەرەبو ١٨٪ی سوننەی عەرەبو ٣-٤٪ی شیعەی کوردو مەسیحی پێك دێ. بەڵام پێوەلکاندنی ویلایەتی مووسڵ بە دانیشتوانە کوردەکەیەوە، ئەو هاوکێشەیەی ئەگۆڕی بۆ ٤٥٪ سوننەو کەمایەتیەکانو ٥٥٪یش شیعە. ئەوە تا ڕادەیەکی زۆر مانەوەی حوکمی لە چنگی چینی سوننەی حوکمداردا زامن ئەکرد[١٨١].

هەر ئەو سەروەختە، واتەواتی هێنانەوەی شێخ مەحموود بڵاوبووەوە. بەڵام حاکمی سیاسی لە سلێمانی، بەهۆی ڕۆژنامەی "پێشکەوتن"ـەوە، ئەو هەواڵەی بەدرۆخستەوە، بە دەق ڕایگەیاند: ((هێشتا حکوومەت هیچ نییەتی نییە بهێڵێ شێخ مەحموود بێتەوە بۆ عیراق یا کوردستان))[١٨٢].

ڕۆژی ١٩٢١/٨/١، تاقمێکی بچووکی چەتەی تورك کە ١٢ کەس بوو، دوای چوونی ئەحمەد تەقیی نوێنەری بەرهەڵستانی ڕەواندز، بە تۆپێكو دوو مەترەلۆزو چەند تفەنگێکەوە، بە فەرماندەیی یوزباشی محێدین

---

[١٨٠] تاریخ الوزارات العراقیة، ج١، ص٤٥، ٥٢، ٥٩.

[١٨١] یقظة الکرد، ص٢٥٦.

[١٨٢] پێشکەوتن، ل٣٠٢.

بەگ گەیشتە ڕەواندز. ئەوانە، دواتر بە هاوکاریی هێزی عەشایەری کورد، (حەریر)و (باتاس)یان گرت، شێخ ڕەقیبی سوورچی کرایە حاکمی حەریر[183]. ئیتر نەیارانی ئینگلیز ڕوویان کردە ناوچەی ڕەواندز. بەشێکی ئاغایانی پشدەریش بە سەرۆکایەتیی عەباسی مەحموود ئاغای ناحەزی ئینگلیز، لەگەڵ هاوبیرانی وەك شێخ ئەمینی سندۆڵان‌و ساڵح ئاغای ئەحمەد ئاغاو بایز ئاغای عەباس ئاغادا، بەهاری ١٩٢٢ هاتنە ڕیزی جووڵانەوەکە، ئەحمەدی حەمەئاغای بێشەریان وەك نوێنەری خۆیان ناردە ڕەواندز. فارس ئاغای زێبار بۆ پیرۆزبایی‌ی سەرکەوتنی جووڵانەوەکە هاتە ڕەواندز. شێخ ئەحمەدی بارزان هات، ٢٠ بارزانیی بە فەرماندەیی‌ی شەریف ناوێك لەوێ هێشتەوە. میرانی ئەحمەد بەگی بێتواتەو ڕەشید بەگی کوریشی هاتنە ڕەواندزو لایەنگرییان نیشان دا. یەکەم کاری مەجلیسی میللی‌ی ڕەواندز هێرش بۆ بردن‌و داگیرکردنی حەریرو باتاس بوو. دەسەڵاتیشی پەرەی سەند، تا ناوچەکانی ئاکرێ‌و ڕانیەو دەربەندی گرتەوە[184].

نامەگۆڕگێی نێوان کۆکس‌و چەرچەڵ لە پاشماوەی ساڵی ١٩٢١و سەرەتای ١٩٢٢دا هەر لەو دوو خاڵە گرنگەی کۆڵیوەتەوە. سۆن دژی ئەوە بوو کە کورد بە کەمایەتییەکی عیراقی دابنرێ؛ کۆتایی‌ی ئەو ساڵە بە ڕاشکاوی ڕای خۆی بەرامبەر بە سەپاندنی حوکمێکی عەرەبی بەسەر

---

[183] هەمان سەرچاوە، ل٣١٣؛ بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی، ل٣٢، ٣٥؛ یادداشت، ب٦، ل١٩-٢٠.

[184] یادداشت، ب٦، ل١٥، ٢٢؛ بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی، ل٣٦.

سلێمانیدا دەربڕی، وا کە ئەبێ کاتی و ڕێخۆشکەر بێ بۆ خوڵقاندنی دەوڵەتێکی کوردی، بۆیە دەستی پێ لە کارەکەی کێشرایەوە. مەندووبی سامی و حکوومەتی عیراق ئامادە بوون دان بە ناسنامەی کوردیدا بنێن، بە مەرجێك لە چوارچێوەی عیراقدا بێ. کۆکس بڕیاری دا لە ١٩٢١/٥/٦دا پرس و ڕاوێژ بە کورد بکات، تا ئارەزووی دەستەو تاقمە کوردیەکان بە بەڵگە بهێنرێتەوە: ئاخۆ ئەیانەوێ لەناو قەڵەمڕەوی حکوومەتی عیراقدا بمێننەوە ؟! بەڵام ئەم ڕاپرسییە تەنیا بە هەڵبژاردەیەکی پیاوماقووڵان و ناودارانی ناوچەکەو ئاغاو سەرخێڵەکان کرا، ئەوانیش زۆریان ئەپانزانی سیاسەتی ئینگلیز بەرەو کوێ ئەچێ لە میزۆپۆتامیا، کەمیشیان هەستیان بە پێویستیی خۆسازدان ئەکرد بۆ بەربەرەکانی و بەگژداچوونەوەی ئەو سیاسەتە. ئەوانەی سلێمانی هەموو جۆرە لکاندنێکیان بە عیراقەوە ڕەت کردەوە، بەڵام ئەوان لەو هەڵوێستەیاندا تەنیا بوون[١٨٥].

زستانی ١٩٢١-١٩٢٢ مەحموود خانی دزڵی زنجیرەیەك هێرشی بردە سەر هەڵەبجە، نائارامیی خستە ناوچەکە[١٨٦]. کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند ١٩٢٢/٦/١٨ کاپتن بۆندی حاکمی سیاسیی چەمچەماڵ و کاپتن ماکانتی فەرماندەی لیڤی و غەفووری خەجێی پیاوی بۆندی لەنزیکی دەربەندی بازیان کوشت[١٨٧]. سەید محەمەدی جەباری مودیر ناحیەی

---

[١٨٥] یقظة الکرد، ص٢٤٦، ٢٤٧.

[١٨٦] هەمان سەرچاوە، ل٢٤٧.

[١٨٧] کرد وترك وعرب، ص٢٢٣؛ یادداشت، ب٢، ل٢٦؛ بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی، ل٤٨-٤٩.

ناوچەکەی کوشت. ئیتر ئەوانە لەگەڵ فەقێ محەممەدی هەمەوەندو دووسەد سوارێکدا هەڵاتنە ڕەواندز[188]. خەڵاتی ۱۰۰۰۰ ڕووپیە دانرا بۆ هەر کەسێك شوێنی کەریم بەگ دەست نیشان بکات[189].

کاتێ ئووزدەمیری ئەفسەرێکی بە ڕەچەڵەك چەرکەسی سوپای تورك ۱۹۲۲/۷/۲۲ گەیشتە ڕەواندز[190]، جێی یووزباشی محێدین بەگی گرتەوە، بوو بە قوماندانی قووای عەسکەری‌و میللی‌ی ڕەواندز، جووڵانەوەکە گوڕی تێکەوت؛ هێزەکانی هێرشیان کردە سەر (ناودەشت)، ۱۹۲۲/۸/۱۲ گرتیان. ۸/۳۱یش (دەربەندی ڕانیە)یان لە هێزەکانی ئینگلیز پاك کردەوە، هەتا شاری (کۆیە)یشیان پێ چۆڵ کردن.[191] تەنانەت چل سەربازی تورك‌و هێزێکی پشدەریان، بە فەرماندەیی‌ی ئەحمەدی حەمە ئاغای پشدەری، ناردە دێی (قەمچووغە)، بە نیازی گرتنی سلێمانی.

دەنگۆی هاتنی ئەو هێزەیش لەڕێی تورکخواکانەوە لەناو شاردا بڵاو بووەوە. هاوکات تەشکیلاتێکی ئیدارییان لە ڕانیەو پشدەر پێك هێنا، بەم شێوەیە:

---

[188] یادداشت، ب٦، ل٢٦؛ چیم دی، ب١، ل٨٤.

[189] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص٢٠٦ (لە ژمارە ٥٢٩ی ١٩٢٢/٦/٢٩ی "الموصل"ەوە وەرگیراوە).

[190] یادداشت، ل٢٢٤؛ بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی، ل٤٦-٤٧.

[191] کرد وترك وعرب، ص٢٢٩-٢٣٤؛ یادداشت، ب٦، ل٢٧-٢٨.

بۆ درێژەی ئەو شەڕانە، بڕوانە: بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی، ل٤٧-٥٢.

بایز ئاغای عەباس ئاغا– قایمقامی پشدەر،

قادر ئاغای مستەفا ئاغا– مودیری مەرگە،

شێخ ئەمینی سندۆڵان– قایمقامی ڕانیە،

غەفوورخان– مودیری ناودەشت،

ئەحمەد تەقی– موفەتیشی ئیداریی هەردوو قەزا،

یووزباشی فەوزی بەگ– قوماندانی عەسکەرو قووای میللیی ڕانیە،

ڕەمزی بەگ– بە هێزێکی عەسکەرو عەشایەرەوە پارێزگاریی دەربەندی پێ سپێردرا[192].

مەلیک فەیسەڵ، چوار حەفتە دوای تاج لەسەرنان، هانی مەندووبی سامیی دا نەهێڵێ ناوچە کوردیەکان وەك لە پەیمانی سیڤەردا هاتووە، لە مەملەکەتی عیراق دابڕێن[193].

سێر پێرسی کۆکسی مەندووبی سامی تشرینی یەکەمی ١٩٢١ ڕەزامەندیی چەرچەڵی وەزیری کۆلۆنیەکانی وەرگرت بۆ لکاندنی ناوچە کوردنشینەکان بە عیراقەوە؛ وا کە ئۆتۆنۆمییەکی ناوچەییان هەبێ و هاوبەشیی ئەنجومەنە گشتیەکەی بکەن؛ ئەگەر حەزیشیان نەکرد، نەخرێنە ژێر دەستی عەرەب. ئیتر لەوکاتەوە مەسەلەی کورد، لانی کەم هێندەی پەیوەندیی بە سیاسەتی بریتانیاوە هەبوو، کۆتاییی هات[194].

---

[192] بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی، ل٥٢–٥٣.

[193] یقظة الکرد، ص٢٦١.

[194] داڤید کورن، هەمان سەرچاوە/ دوا ئەڵقە، "الاتحاد"، ژ٣٢٦، ١٩٩٩/٧/٩، ل١٥.

ئەنجومەنی تایبەتی لیوای سلێمانی، ڕۆژی ١٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٢١، هەڵبژێردرایەوە، لەمانە: حاجی سەعید ئاغاو حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغاو جەمال عیرفانو حاجی برایم ئاغای خەفاف و چوار کەسی قەزاکان- ئەمین ئاغای ڕەشید ئاغای هەمەوەندو حەمەساڵح بەگی حەمەعەلی بەگو حامید بەگی مەجید بەگی وەسمان پاشاو هەمزە ئاغای ئەولا ئاغاو چواریش لە مەئمووران- ئەحمەد موختاری قازیو سدیق مەزهەرو ساڵح پاشاو کاپتن هۆڵتی یاریدەدەری حاکمی سیاسی[١٩٥].

ئەنجومەنی وەزیرانی حکوومەتی پاشایەتیی عێراق لە ١٩٢١/١٢/٢٧دا بڕیاری دا زمانی عەرەبی، لەبری ئینگلیزی، لە سەری ساڵی داراییی داهاتووەوە (نیسانی ١٩٢٢) ببێتە زمانی ڕەسمی لە هەموو وڵاتدا. هەر ئەو ئەنجومەنە، ساڵی دواییو لە ١٩٢٢/٧/٢دا بڕیاری لەسەر یاسای (الجمعیات)[١٩٦] دا، کە کورد بەپێی پێنجەم خاڵی چوارەم ماددەی یاساکە، مافی ئەوەی لێ سەنرایەوە کۆمەڵەو حیزبی سیاسیی کوردیی ڕێپێدراو دابمەزرێنێ؛ پێبەپێ دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤار ی سیاسیی کوردیی ئاشکرایشی لێ قەدەغەکرا. ئەو بڕیارە بە درێژاییی حوکمی پاشایەتی کاری پێ کرا.

---

[١٩٥] پێشکەوتن، ل٣٥٢-٣٥٤؛ یادداشت، ب٣، ل٢٠-٢٢.

[١٩٦] تاریخ الوزارات العراقیة، ج١، ص١١٣؛ الحکومة العراقیة/ وزارة العدلیة، مجموعة البیانات و النظامات العدلیة ما صدر بین ١٩٢٠/١٠/١- ١٩٢٢/١٢/٣١ من قوانین، مطبعة العراق- بغداد، بلا، ص٢٣٢، ٢٣٣.

- شێخ فەرەجی بانی بنۆك، ئایاری ۱۹۲۲ بە خزم‌و عەشیرەتەوە ڕێی سلێمانی- هەڵەبجەی بەست. هێزێکی لیڤی، بە فەرماندەیی‌ی جەنڕاڵ نایتینگێڵ پەلاماری دێی (بانی بنۆك)ی داو سووتاندی. حەمەی سان ئەحمەدیش لە ناوچەی شەمێران هەستا، ئەوناوەی لە حکوومەت پاك کردەوە[197]. ڕەفعەت بەگی ئیسماعیل بەگی داودە لە ناوچەی داقووق لە ئینگلیز یاخی بوو، هەتا لای تووزخورماتووی خستە بەر شالاوی تێکدان‌و پشێوی. کۆتایی‌ی ئایار هۆزەکانی جەباری لە ناوچەی کەرکووك چەکیان هەڵگرت‌و لە ئینگلیز ڕاست بوونەوە[198].

هەمان ساڵ، "ئەحمەد بەگی پیشێن"ی بەگزادەیەکی جاف، کە لەبەر پەیوەندیی بە مەحموود خانی دزڵی‌یەوە بە هاندانی بەگزادەکانی هەڵەبجە گیرابوو، لە سلێمانی خرابوە بە چاودێری، هەڵات‌و چووە لای "جافر سوڵتان"ی سەرۆکی هەورامان. کاتی هەڵاتن، شەڕێکی مەردانەی لەگەڵ هێزی ئینگلیزدا کرد. ڤیتزگیبۆنی فەرماندەی هێزەکەو ۱۱ لیڤی‌ی تر لەو شەڕەدا کوژران. لە (هەورامان)یش فڕۆکەی نێردرایە سەرو لێی خرایە خوارەوە[199].

ساڵی ۱۹۲۲ بەشێکی مونەووەرانی سلێمانی پێیان وابوو هەلومەرجی شۆڕش لە کوردستانی ئێران لەبارترە، بۆیە بڕیاریان دا بچنە پاڵ

---

[197] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص۲۰۵ (لە ژمارە ۵۲۷ی ۱۹۲۲/٦/۲۲ی ڕۆژنامەی "الموصل"ەوە وەرگیراوە) ؛ چیم دی، ب۱، ل۷۹-۸۰، ۸۲.

[198] هەمان سەرچاوە، ل۲۲۳.

[199] یادداشت، ب۵، ل٦۷.

جووڵانەوەکەی سمکۆ، تا هێزو گورێکی پێببەخشن و نەخشیان لە ڕێنوێنی و پێش خستنیدا هەبێ؛ لەوانە، سدیق شاوەیس و ڕەشید جەودەت و عارف صائیب و فایەقی ئیسماعیل بەگ و ماجد مستەفاو فوئاد مەستی، ڕوویان کردە ئەودیو. هەر کە گەیشتنە بۆکان، بیستیان وەزیری جەنگی ئێران ڕای گەیاندووە کە جووڵانەوەکەی سمکۆ شکێنراوە. لەبەرئەوە ناچار گەڕانەوە، لە دێی (چنگیان) بیستیان ئینگلیز سلێمانیی بەجێهێشتووە، شێخ قادر بووەتە دەسەڵاتداری شار، ئیتر هاتنەوە[200].

ڕۆژبەڕۆژ ژمارەی داواکارانی هێنانەوەی شێخ زیاد ئەبوو. ڕای گشتیی بریتانیایش تەنگی بە حکوومەت هەڵئەچنی، داوای گێڕانەوەی سەربازانی ئینگلیز بۆ وڵاتی خۆیان و کەمکردنەوەی خەرجیی عەسکەریی ئەکرد؛ ڕازی نەئەبوو خەرجیی زیاتر بسەپێنرێ. هاوکات خەزێنەی بریتانیا تووشی کورتهێنان بووبوو[201]. لەبەرئەوەی کەس نەبوو بخرێتە شوێنی شێخ مەحموود، گوڵد سمیث ناچار بوو ڕاسپێرێ شێخ بە هەمان پلەوپایەی پێشوویەوە بهێننەوە[202]. ئەوە بوو ١٩٢٢/١/٢٧ لەگەڵ شێخ محەمەد غەریبدا گوێزرایەوە بۆ کوێت. ڕۆژی ٩/١٣ی ئەو ساڵەیش لەوێوە هێنرایەوە بۆ بەغدا[203].

---

[200] احمد خواجە، چیم دی، ب١، چاپخانەی شفیق- بغداد، ١٩٦٨، ل٦٤؛ ك، صفحات من الماضي يرويها الاستاذ فؤاد مستي، "التآخي" (جريدة)، بغداد، العدد ١٥٨٢، ٢١ كانون الثاني ١٩٧٤.

[201] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص٢٠٧، ٢١١.

[202] كرد وترك وعرب، ص١١٤.

[203] م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب٢، ل٢٧٤، ٢٧٥.

شێخ، بە بۆچوونی دانا ئادەم شمیدت، ئەبوو لەبەر بەرژەوەندی بریتانیا بهێنرێتەوە. تورکەکان هێزی ئینگلیزیان لەوناوەدا پەرێشان کردبوو. بەکارهێنانی شێخ بۆ دوورخستنەوەی ئەو مەترسیانە، ئەبوە هۆی جۆشدانی هەستی نیشتمانیی کورد بۆ زیاتر بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەکانی تورك. ئەوسا ئینگلیز پێی ئەکرا ڕووداوەکانی سالّی ١٩١٩، کە بەشێکی زۆری کوردی تێدا هاوسۆزی شێخی شۆڕشگێڕی دیل بوو، بە قازانجی خۆی بخاتە کارو شێخ بکاتەوە بە حوکمدار. بەوپێیە شێخ ئەبوە ڕەمزی یەکخستنی هەستی نیشتمانی، بەلاّم ئەمجارە بە پشتیوانیی و دەستخۆشیی بریتانیا[٢٠٤].

هێنانەوەی شێخ و کردنی بە حوکمداری سلێمانی و دەوروبەری، جەرجیس فەتحولّلا وتەنی، پاداشتێکی ئایەخ و هیچ بوو. شێخ لەوە بێئاگا نەبوو کە بە ناچاریی و لەبەر کارێکی گرنگ هێنراوەتەوە. جا ئەگەر بۆ ئەوە بووبێ کە ملیان بۆ داوای خەلّکەکە شۆڕ کردبێ، یا بەڕادەیەك بێهێزو بێسەرەودەرە بووبن نەیانتوانیبێ بەبێ ئەو کۆنترۆلّی کوردستان بکەن، بەلاّم هێنانەوەکەی بەڕوونی سەلماندی کە ئەویان بە گرنگترین شەخسیەتی باشووری کوردستان زانیوە[٢٠٥].

---

هاوار لە کتێبی (تاریخ الكويت السياسي)ی "حسين خلف الشيخ خزعل"ی وەرگرتووە کە شێخ لە هیندستانەوە هێنرایە کوێت، پشت بەستوو بە ڕاپۆرتی سالّی ١٩٢١ی نۆئێل کە وتوویە شێخ ئەوکاتە لە دوورگەی هەنجام بووە، ڕاستتر وایە لەو دوورگەیەوە هێنرابێتە کوێت.

[٢٠٤] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص٢١٩.

[٢٠٥] يقظة الكرد، ص٢٥٨.

حکوومـەتی تورکیـا لـە ١٩٢٢/٣/٧دا بڕیـاری دا "ڕەمـزی بـەگ" بـە قایمقامی ڕەواندز دابنـرێ" کۆتایی‌ی ئایار کە گەیشتەجێ، بە هەڕەشەو گفـت‌و بـەڵێن‌و دەم چـەورکردن‌و مـەرایی کەوتـە چـالاکی کـردن لـەناو هۆزەکاندا، بە هەڵبەستنی هەواڵی نزیکبوونەوەی هێزێکی گەورەی تورکی بۆ دەرهێنانی سلێمانی‌و کەرکووك‌و هەولێر لە چنگی ئینگلیز[٢٠٦].

سۆن لە وتارێکدا نووسیویە: سەرکەوتنی تـورك لـە ناوچـەی ڕانیـە، بـەهۆی ئـەو سیاسـەتە چـەوتەوە بـوو کـە کاربەدەسـتانی بریتانیـا لـە کوردسـتان پێڕەوی کـرد. سـەرباری ئـەوە، شـکانی سمکـۆ لـە ئێـران‌و بلاوەپێکردنی لایەنگرەکانی، زۆرینەیانی ناچار کرد بچنە پاڵ تورك، کە دەم‌ودەست بەکاری هێنان. زۆری هێزەکەی ئووزدەمیر لە کوردانی سەر بە سمکۆ بوون[٢٠٧].

تۆفیـق وەهبـی لەوماوەیـەدا پێـی وابـوو پێویـستە کـورد ڕازی بکـرێ، بـەوەی کـە ڕێـی بـدرێ حوکمـدارێك بۆ سـلێمانی هەڵبـژێرێ. ئـەوە بـوو لـە حوزەیرانی ١٩٢٢دا پێشنیاری کرد بە هەڵبژاردن حوکمـدارێك بۆ ناوچـەی سلێمانی دیاری بکرێ‌و ئیدارەیـەکی کوردی بە چاودێری‌ی ئینگلیـز ڕێك بخـرێ، بایـەخ بـە خوێنـدەواری‌و ڕۆشـنبیری بـدات. کاربەدەسـتانی ئینگلیزیـشی لـەوە ئاگـادار کـردووەوە کـە دانیـشتوانی ناوچـەکە داوای هێنانـەوەی شێخ ئەکـەن[٢٠٨]. تەنانـەت بۆ ئـەم مەبەسـتە لەگـەڵ مس بێڵدا

---

[٢٠٦] هەمان سەرچاوە، ل٢٤٨.

[٢٠٧] هەمان سەرچاوە، ل٢٥٠.

[٢٠٨] م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب١، ٢٧١-٢٧٢.

سەفەرێكی نهێنیی بۆ سلێمانی كرد، بەڵام ئەنجامێكی بەرچاوی لێ نەكەوتەوە[209].

سلێمانی لەورۆژانەدا ئەكوڵا. لایەنگرانی شێخ شایی و ئاهەنگیان تێك ئەداو پەلاماری ئەوانەیان ئەدا كە ئامێری مۆسیقایان بەكار ئەهێنا؛ هێندی ماڵ و خانیان تالآن ئەكرد، بە بیانووی هاوكاریی خاوەنەكانیانەوە لەگەڵ كاربەدەستانی ئینگلیزدا[210].

كۆبونەوەیەكی فراوان لە پاشنیوەڕۆی هەینیی ١٩٢٢/٧/٢١دا، بە داوای مستەفا پاشا یامولكی و مۆڵەت و یارمەتیی حكوومەتی سیاسیی سلێمانی و بڕیاری هەندێ گەورەپیاوو مونەووەری شار، بە ئامادەبوونی زانایان و پیران و پیاوماقووڵان و مونەووەران و كاسبكاران، لە مزگەوتی حاجی سەید حەسەنی موفتی ساز كرا. بڕیار لەسەر دامەزراندنی كۆمەڵەیەكی سیاسی بە ناوی (جەمعییەتی كوردستان)ـەوەو بە سەرۆكایەتیی مستەفا پاشا یامولكی درا.

ئەم سیانزە كەسە بۆ ئەندامێتیی دەستەی بەڕێوەبردنی هەڵبژێردران: ڕەفیق حیلمی و ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ و ساڵح ئەفەندیی قەپتانچی و فایەق بەگی مەعرووف بەگ و حاجی ئاغا فەتحوڵڵاو عیززەت بەگی وەسمان پاشاو ئەدهەم ئەفەندیی یووزباشی و ئەحمەد بەهجەت ئەفەندیی یووزباشی و شێخ محەمەدی گولانی و شێخ عەلیی سەركارو عەلی باپیر ئاغاو عەبدوڵڵای محەمەد ئەفەندی و شوكریی عەلەكە.

---

[209] بیرەوەرییەكانی ئەحمەد تەقی، ل٣٦.

[210] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص٢٢٤.

ڕۆژنامـــەی حەفتانـــەی "بـــانگی کوردســـتان" کرایـــە زمـــانی حـــاڵی جەمعییەتەکـــە، مـــستەفا پاشـــا ئیمتیازەکـــەی وەرگـــرت و مـــودیری مەسئوولیـــشی بـــوو. عـــەلی کـــەمال بـــاپیرو شـــێخ نـــووریی شـــێخ ســـاڵح موحەڕریری کوردی و فارسی، ڕەفیق حیلمی موحەڕریری تورکیی بوو[211].

یەکـەم ژمـارەی کـە لێـی نێردرایـە کوەیـت بـۆ شـێخ مـەحموود و ئـەویش دووسەد ڕووپیەی بە تەلگراف بۆ ئیدارەخانەی نارد[212]، ٢ی ئابی ١٩٢٢ دەرچوو، لەکاتێکدا "پێشکەوتن" هـەر بەوهۆیـەوە، پێشتر لـە ژمـارە (١١٨)ی ڕۆژی ٢٧ی تەمووزی ١٩٢٢دا ڕاگیرا.

ئابی ١٩٢٢ هەڵبژاردن بۆ ئەنجومەنی لیوای سلێمانی کرایەوە. ڕۆژی ١٩٢٢/٨/٢٣ (منتخب ثانی) لەلایـەن (منتخب أول)ـەکانەوە هەڵبـژێردرا. دواتر دوو ئەندامی تریشی بۆ دەستنیشان کرا[213].

٢٣ی ئـابی ١٩٢٢ هێزەکـانی ئینگلیـز هێرشـیان بـردە سـەر ناوچـەی ڕانیـە. هێـزی کـوردی سـەر بـە جووڵانـەوەی ڕەوانـدز لـە دەربەنـدی ڕانیـە بەرەنگاریان بووەوە، شکاندنی و ڕاوەدووی نان[214].

شـێخ قـادری حەفیـد ئـابی ١٩٢٢ ڕێـی درا لەبەغـداوە بێتـەوە بـۆ سـلێمانی[215]. دووەم نیـوەی ئـەو مانگـە هاتـە دێی (داریکـەلی)، سـەرەتای ئەیلوولیش گەیشتە سلێمانی[216].

---

[211] بانگی کوردستان، ژ١، ٢ آغستوس ١٩٢٢، ل١-٢، ٣.

[212] هەمان سەرچاوە، ژ٧، ٢٢ ایلول ١٩٢٢، ل٣.

[213] هەمان سەرچاوە، ژ٣، ٢١ آغستوس ١٩٢٢، ل٥، ٦.

[214] یادداشت، ب٤، ل١٢١.

### ٢. ٢. ٢. دەورانی مەجلیسی میللیی کوردستان:

١٩٢٢/٩/٤ شەش فڕۆکە لە دەشتی تەیارەخانەکە نیشتەوە[٢١٧]. گوڵد سمیثی حاکمی سیاسی، بەیانیی ١٩٢٢/٩/٥ زوو، شێخ قادری لەگەڵ مستەفا پاشاو حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغاو عەبدولفەتاح چەلەبیو مەجید ئەفەندیی حاجی ڕەسووڵ ئاغا (کانێسکان)ی ئەندامانی مەجلیسی لیواداو ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگیش لە ئەشراف، بانگ کردە کەناری شار (شوێنی تەیارەکان)، کۆبوونەوەی پێکردن. بڕیاری کشانەوەی هەموو مەئمووراني ئینگلیزی لە شار پێڕاگەیاندن" مەجلیسێکی لیوای بە سەرۆکایەتیی شێخ قادر لێ پێك هێنان، هەموو خەزێنەو عەسکەرو پۆلیسو چەكو جبەخانەو ئازووخەو فەرماندەییی ٢٠٠ سەربازی کوردی پێ سپاردن. خەزێنە، بەقسەی سۆن، ١٤٥ هەزار ڕووپیەی تێدا بوو. ئەوانە هەر هەووەڵ جار، داوای هێنانەوەی شێخ مەحموودیان لێ کرد. دانانی شێخ قادر خۆی لە خۆیدا ڕێخۆشکردن بوو بۆ هێنانەوەی شێخ مەحموود.

مەئموورانی ئینگلیز سەرجەم بە فڕۆکە برانە کەرکووك. نۆئێل ئەوکاتە حاکمی سیاسیی هەڵەبجەو ناوچەکانی جاف بوو. ئەو مەجلیسە، هاتەوە بۆ ناو شار، لە دائیرەی حکوومەتدا کۆبووەوە بۆ ڕێککەوتن لەسەر

---

[٢١٥] کرد وترك وعرب، ص٢٦٣.

[٢١٦] بانگی کوردستان، ژ٣، ل٥و، ژ٥، ٤ ایلول ١٩٢٢، ل٦.

[٢١٧] عبدالرحمن إدریس صالح البیاتي، المصدر نفسه، ص٢٢٦. لە ژمارە ٢١٩٦ی ١٩٢٢/٩/٢١ی ڕۆژنامەی "البشیر"ی بەیرووت وەرگیراوە.

پاراستنی ئاسایش. چەند گەورەپیاوێکی تریش بانگ کران، هەموان نامەیەکی دڵنیایی‌یان ئیمزا کرد کە کەس دوای مەبەستی شەخسی نەکەوێ‌و هەوڵ بۆ قازانجی نیشتمان‌و میللەت بدرێ[٢١٨].

لیژنەیەکی دوانزە کەسی بۆ پاراستنی ئاسایش پێك هێنرا، سەرپەرشتی‌ی ئەو کارەیش بە یوونس عەبدولقادر (ماهی)ی فەرماندەیەکی پێشووی سوپای لیڤی سپێردرا کە سەربازەکانی خۆی بەسەر شاردا دابەش کردو شەوو ڕۆژ کەوتنە کار. یوونس پەیوەندی‌ی بەردەوامی، لەڕێگەی پۆستەخانەوە، بە ئەدمۆندزەوە هەبوو لە کەرکووك. هەتا پێنج چەکداری جوولانەوەی ڕەواندز لەپڕدا گرتیان‌و بردیانە ڕانیە[٢١٩].

ڕۆژی ٩/٦، کەریم بەگی فەتاح بەگ‌و محەمەدئەمین ئاغای فەقێ قادرو فەقێ محەمەدی حاجی سەرۆکی ڕەشەوەندو کوڕانی کاك عەبدوڵڵا عەزیز خالیدو ئەتباعیان، هاتنە ناو سلێمانی. پێشتر شێخ عەبدولقادری گوللەنەبڕی حاکمی سەنگاوو شێخ مستەفای کوڕی‌و پیاوەکانیان، هاتبوونە ناو شارو سەرقاڵی پاراستنی هێمنی‌و ئاسایش بوون.

---

[٢١٨] هەمان سەرچاوە، ژ٦، ل١-٢؛ يقظة الكرد، ص٢٥١، ٢٥٣.

[٢١٩] هەڵۆ، ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی هەندێك لە باسەکانی چیم دی، "بەیان" (گۆڤار)، بەغدا، ژ٥، کانوونی دووەمی ١٩٧١.

جێی باسە ئەو "هەڵۆ" ناوە، وەك خاتوو خەرامانی فوئاد مەستی‌و کاك مستەفا ساڵح کەریم بەدڵنیایی‌یەوە جەختیان کردەوە، خوالێخۆشبوو فوئاد مەستی‌یە.

٩/٧، دوای تەواوبوونی نوێژی جومعە، گەورەپیاوان و مونەووەران، بە فەرمانی شێخ قادر، لە دەرو ژووری دائیرەی سیاسی کۆبوونەوە بۆ بڕیاردان لەم سێ خاڵە:

١- پێکهێنانی حکوومەت بۆ کوردستان،
٢- قوبووڵو پێشوازیی عەسکەری تورک،
٣- هەڵوێست بەرامبەر بە حکوومەتی ئینگلیز.

کۆڕەکە بەگشتی لایەنگری دامەزراندنی حکوومەتی کوردستان بوو؛ هەتا مستەفا پاشایشی لەلایەن کەریم بەگی هەمەوەندو چەکدارەکانیەوە تێدا گیرا، بە هەوڵی سەران‌و مونەووەران بەردرا، بارودۆخەکە ئارام‌و ئاسایی کرایەوە[٢٢٠].

ڕۆژی ٩/٨ شێخ قادری حەفید، سەید ئەحمەدی هەنجیرەی بە ئوتومبیل ناردە کەرکووک بۆ پەیجۆری هەواڵی شێخ مەحموود. ٩/١٠ سەید محەمەدی جەباری‌و پیاوانی لە چەمچەماڵەوە، محەمەد ئاغای عەلی ئاغای پشدەر لە قەڵادزێوە، هاتنە سلێمانی. ٩/١١ بەگزادەکانی هەمەوەند چوونەوە بۆ چەمچەماڵ‌و سووورداش. ٩/١٢ سەید ئەحمەدی هەنجیرە لە کەرکووکەوە هاتەوە، هەواڵی لە (کوێت)ەوە جوولانی شێخی بەرەو بەغدا هێنایەوە. ئەو ماوەیە، هەڵگرتنی هەموو جۆرە چەکێك لەناو شاردا، بە فەرمانی سەرۆکی مەجلیسی میللی، قەدەغەکرا. وەزیفە درایە ساداتی بەرزنجە کە هاتبوونە لای شێخ قادر. شێخانی تیمارو شێخ ئەورەحمانی

---

[٢٢٠] بانگی کوردستان، ژ٦، ١٨ ایلول ١٩٢٢، ل١-٤.

داراغا بۆ پاراستنی کاروان‌و ڕێگەی بەغدا ڕاسپێردران، بە چاکی بەجێیان هێنا.

شێخ عەبدولقادری سەنگاوو شێخ مستەفای کوڕی، شەوانە بە سوارەکانیانەوە ئاسایشی شاریان ئەپاراست. شێخ عەبدوڕڕەحمانی داراغاو شێخ محەمەدی شێخ عەبدولکەریمیش دەوریان لە پارێزگاریی ئاسایشی ناوەوەو دەوروبەری شاردا بینی. شێخ قادر ڕۆژی ٩/٦ عەبدوڵڵا ئاغای بڕواپێکراوی خۆی نارده لای سووورداش‌و دووکان، بۆ ساغکردنەوەی دەنگۆی هاتنی عەسکەری تورك" ٩/١٢ هاتەوە، هەواڵەکەی بەدرۆخستەوە.

"بانگی کوردستان" لە (ئیعلانی ڕەسمی)یەکدا ڕای گەیاند: ((مەعلوومتان بێ کوردستان ڕۆژی لێ بووەوە حکوومەتی بریتانیا لە مەمالیکی خۆیا ئیعلانی کردووە بە قەراری ئەورووپا ئیدارەی موستەقیللەی کوردستان تەودیع بە جەنابی شێخ مەحموودیان کردووەو بە نیابەت جەنابی شێخ قادر ئەفەندیی تەعیین کردووەو بۆ تەحکیمی حودوود کە کفری‌و کەرکووك‌و هەولێرە تەشەبوث کراوە. بۆ ئەمە هەموو کوردێ لازمە شادو ئیعلانی ئازادی بکا))[٢٢١].

غەزەتەی "نەجمە"ی کەرکووك‌و غەزەتەی "بەغداد"، ئەو ڕۆژانە چۆڵکردنی سلێمانی‌یان لەلایەن ئینگلیزەوە، بە نیشانەی سەربەخۆیی‌ی کوردستان لێك دایەوە. لەو ماوەیەدا، کۆبوونەوەیەکی گەورە لە ماڵی شێخ قادری سەرۆکی مەجلیسی میللیدا کرا، بڕیاری تێدا درا کۆنگرەیەکی

---

[٢٢١] هەمان سەرچاوە، ژ٦، ل٦.

گشتی له مزگەوتی گەورە ساز بکریٚ‌و ئالای میللی‌ی کورد به ئاشکرا بەرز بکریتەوه. ٩/١٥ دوای نویٚژی جومعە، عەسکەرو شاگردانی مەکتەب‌و پیاوماقوولان‌و ئەهالی‌و سەرانی عەشایەر که ١٠ هەزار کەسیٚك ئەبوون له حەوشەی مزگەوتی گەورە کۆبوونەوە، قوتابیانی ریزبەستووی کوڕو کچ پیٚکەوە گۆرانی‌و سروودی میللییان به ئاوازیٚکی شیرین وت. ڕەفیق حیلمی وتاریٚکی دریٚژی پرخرۆشی لەبەر دا. بەیداغی میللی‌ی کوردستان بەرزکرایەوە، لەسەر دائیرەکانی حکوومەت‌و قشلەی عەسکەریش هەلکرا. دەستریٚژی تفەنگ کراو تۆپی خۆشی تەقیٚنرا. ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ که شیٚخ قادر ڕەوانەی لای سەرانی پشدەری کردبوو، ٩/١٥ گەڕایەوە[٢٢٢].

شیٚخ قادر نیشانیٚکی مانگی یەکشەوەو ئەستیٚرەی له زیٚڕ دروست کرد، (فیدای میللییەت)ی لیٚ هەلکەنراو گرتی به بازووی خۆیدا[٢٢٣].

ئینگلیز نائومیٚد بوو لەوەی که بتوانیٚ به داهات‌و ئیمکانیەتی تایبەتی خۆی تورك دەرپەڕیٚنیٚ له ڕەواندزو پشدەرو ڕانیه بۆ ئەودیوی سنوور. بۆیه هاته سەر ئەوەی که شیٚخ مەحموود بەکاربهیٚنیٚ. برِیاردرا شیٚخ بیٚتەوە، داوا له تورکەکان بکات ئەوناوە چۆل بکەن یا خۆیان بەجیٚی بهیٚلن؛ گفتیشی بدریٚتیٚ کەرکووك‌و هەولیٚر تا ئاکریٚ‌و ناوچە کوردنشینەکانی ویلایەتی مووسلی بخەنه ژیٚر دەست[٢٢٤].

---

[٢٢٢] هەمان سەرچاوە، ژ٧، ٢٢ ایلول ١٩٢٢، ل١-٢؛ یادداشت، ب٥، ل٩٥.

[٢٢٣] هەمان سەرچاوە، ژ٨، ل٢.

[٢٢٤] کرد وترك وعرب، ص٢٣٤، ٢٧٤؛ یادداشت، بەشی دووەم /ب٦، ل٧١.

ئیدارەی ئینگلیز ئەم پاساوە ڕەسمییەی بۆ لێبوردن لە شێخ و ئاسانکردنی گێڕانەوەی هێنایەوە: ((پاداشتێکی شەخسییە بۆ ئەو هەڵوێستە کە بنەماڵەکەی لە پشێویەکاندا نواندی و هیچ بەشدارییەکی تێدا نەکردن)). هێنانەوەی شێخ و پشت پێ بەستنی، لەبەر پلەوپایە دینییەکەی نەبوو، بەڵکوو نوێنەرایەتی‌ی هێزێکی نەتەوەیی‌ی بوێرو کارای ئەکرد لە شارو دێدا، هەروەها ئەکرا بەکار بهێنرێ بۆ پڕوپاگەندەی دژی تورك[٢٢٥].

مێجەر گۆڵد سمیث ٩/١٣ بە نامەیەك بۆ شێخ عەبدولکەریمی قادرکەرەمی نووسیبوو کە شێخ مەحموودو شێخ محەمەد غەریب ئەمڕۆ ئەگەنە بەغدا، لە یەکەم هەلدا ڕووئەکەنە کفری.

ڕەفیق حیلمی، وا چاوەڕوانی‌ی خەڵکی نواندووە: (( لە هەموولایەکی کوردستانەوە پۆل‌پۆل و دەستەدەستە ئەهالی و عەشایەر- بە پێیان و بە سواری- ڕێیان گرتوەبەر. ڕووەو بەغدا ئەچوون و تا دەوری کفری و هەندێکیشیان تا نزیك بەغدا ڕۆیشتبوون. ڕێگەربان بە عەشایەری پڕچەك و سیلاح ڕازابوەوە. وەکو ئەیان گێڕایەوە نزیکەی بیست هەزار سوارێکی کورد ڕژابوونە ئەو دەشتە. ئەمانە هەموویان لەگەڵ ئەو دووای خەڵقی کوردستان چاویان بڕیبوە ئاسۆ. بە چەشنی هیلالی شەوی جەژن بۆ دیداری حوکمداری کورد ئەگەڕان))[٢٢٦].

ئەووزدەمیر لە نامەی ٩/١٥ /٣٣٨ (١٩٢٢)ی خۆیدا بۆ شێخ قادر، نووسیویە: ویلایەتی مووسڵ خراوەتە ناو میثاقی میللی‌ی تورکەوە. بۆیە

---

[٢٢٥] یقظة الکرد، ص٢٥٤،٢٥٣.

[٢٢٦] یادداشت، ب٥، ل١٠٠.

دەست بە پاككردنەوەی ئەم هەرێمە ئەكەین لە ئینگلیزو خائینان ... وا مەفرەزەیەك بە فەرماندەیی‌ی یووزباشی فەوزی بەگی كوڕی موشیر مستەفا نووری پاشا ئەنێرینە سلێمانی، تا تەشكیلاتێكی ئیداریی تێدا پێك بهێنین[227].

بەگزادانی جاف، حسێن بەگی حەسەن بەگو ئەحمەد موختار بەگو حەمید بەگو محەمەد بەگی فەتاح بەگو جەمال بەگی جەمیل بەگو ئەحمەد بەگی محەمەد بەگ، بە داوای شێخ قادر، هاتنە سلێمانی" ٩/١٩ گەڕانەوە بۆ هەڵەبجە[228]. شێخ مەحموود لە بەغدا چاوی بە فەیسەڵی یەكەمی مەلیكی عیراقو مەندووبی سامی كەوت[229]. ٩/٢٠ بە شەمەندەفەر لە بەغداوە جوولا. بەیانی‌ی ٩/٢١ گەیشتە وێستگەی كەنگربانی ٤ میل لە كفری‌یەوە دوور. سەدان سوارەی عەشایەر بۆ پێشوازی ڕاوەستابوون، هوتافیان بۆ كێشاو ئالآیان شەكاندەوەو خۆیان بۆ هەڵدا؛ شێخ نۆمایەكی ڕەنگ ئاڵی چوارپەلو ناوپاوان سپی‌ی لە سورمەی زیو گیراوی لەلایەن ڕەفعەتو حەسەنی كوڕانی ئیسماعیل بەگی داودەوە بۆ ئامادە كرابوو، بە باوەش خستیانە سەری. فڕاندیانو وەك سەركەوتوویەك بردیان، پێش ئەوەی وەفدی سلێمانی، مستەفا پاشاو ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگو حەمەئاغای ئەورەحمان ئاغاو عیززەت بەگی وەسمان پاشا، كە شێخ داوای كردبوو و شەوی ٩/١٩ بە ئوتومبیل لەڕێگەی چەمچەماڵو

---

[227] هەمان سەرچاوە، ب٦، ل٦٤-٦٧.

[228] بانگی كوردستان، ژ٧، ل٤.

[229] بانگی كوردستان، ژ٨، ل٢؛ بیرەوەریەكانی ئەحمەد تەقی، ل١٦.

کەرکووکەوە چووە کفری، بتوانێ وتەیەکی بەخێرهاتنەوە بخوێنێتەوە. ئەندامانی ئەو وەفدە، بە قسەی ئەدمۆندز، خۆیان بە کاربەدەستی حکوومەتی نیشتمانیی کاتیی کورد داناوە. خەڵك بە تەپڵ لێدان و دەف و دایەرەو بەیداخ هەڵکردنەوە سەلاواتیان داو بە دەنگی (الله اکبر) ئەو سەعاتەڕێیەیان لەبەر قەرەباڵغی بە دوو ئەوەندە بڕی. شێخیان لەماڵی سەید موحسین ئاغای سەید ئەحمەد ئاغای سەید عومەری گەورە دابەزاند[230].

شێخ لەوێ چاوی بە گەلێ گەورەپیاوو سەرەك خێڵ کەوت، گفتوگۆی لەگەڵدا کردن. خانەدانەکانی کفریی وەك سەید موحسین ئاغاو جەمیل بەگی بابان و سەید عومەر ئاغاو سەید قادر ئاغاو حاجی ڕەشید ئاغا، میوانداریی و دڵسۆزییەکی زۆریان بۆ شێخ نواند. هەتا کەریم بەگی فەتاح بەگ و حەمید بەگ و ئەحمەد موختار بەگ لە بەگزادانی جاف چوونە کفریی و سەریان لە شێخ دا، چوونەوە بۆ کەلار تا دواتر لەوێوە بێنە سلێمانی[231].

ئەفسەرانی کوردی وەك میرلیوا سدیق پاشای قادریی و بینباشی تۆفیق وەهبی و بینباشی خالید سەعیدو یووزباشی ڕەشید ئەفەندیی ئەمین

---

[230] کرد وترك وعرب، ص٢٥٤، ٢٦٨؛ بانگی کوردستان، ژ٧، ل٤و، ژ٩، ٨ تشرین اول ١٩٢٢، ل٢؛ عبدالکریم حمید عبدالکریم، کفری میوانداریتی شێخ مەحموودی نەمر دەکات، "ڕەنگین" (گۆڤار)، ١٩٨٩ (ئەم بابەتە بیرەوەریی ئەحمەد عەلی نەفتچیی تێدا تۆمار کراوە).

[231] بانگی کوردستان، ژ٩، ل٤.

ئاغاو مولازم ئەمین ئەفەندیو مولازم عەزیز حیکمەتو مولازم عەبدولعەزیزو مولازم ئەمین ڕەواندزیو مولازم عەزیز کوردیو مولازم عەلی کوردیو فایەق کاکەمین، کە بە پێشنیاری شێخ مەحموودو ڕەزامەندیی مەندووبی سامی لەگەڵ شێخدا هاتبوونە کفری، لەگەڵ وەفدەکەی سلێمانیدا ڕۆژی ٩/٢٥ گەیشتنە سلێمانی[٢٣٢].

تورکخواکانو لایەنگرانیان، لەم کاتانەدا، بە گەرمی کەوتنە بڵاوکردنەوەی واتەواتی هاتنی هێزی تورك بۆ سلێمانی، هەڕەشەیان پێ لە نەیارانی تورك ئەکرد. ٩/٢٤ کە وەفدە نێردراوەکە بۆ کفری دواکەوتو نەهاتەوە، قاویان داخست گوایە ئەوانە براونەتە بەغدا یا خراونەتە زیندان. نامەی ساختەیشیان بڵاوکردەوە کە خەڵکی سلێمانی بەپیر عەسکەری تورکەوە بچن؛ ئەگەر نەچن، هێزی پشدەر کۆنترۆڵی شار ئەکات. ئەگەر مستەفا پاشاو دۆستانیشی بگیرێن، پلەی پاشایی ئەدرێتە عەباسیمەحموود ئاغای سەرۆکی پشدەر" یان مەفرەزەکەی دووکان فەرمانی پێدراوە حوکمی عورفی لە سلێمانی ڕابگەیەنێ.

ئوزدەمیر لە نامەی ١٩٢٢/٩/٢٩ی خۆیدا کە بۆ شێخ مەحموودی نووسیوە: سیاسەتی خۆیی بۆ ڕوون بکاتەوەو ئامادەیە مەفرەزەکەی تا ڕانیە بکێشێتەوە. ئەوکاتە تورکخواکانو شاترەکانی تورك لە هاتوچۆدا بوونو دەوری حوکمداریان دابوو. ئەڵقەی پەیوەندیی حوکمدار لەگەڵ تورکانی ڕەواندزدا تایەری ئەمین مەسرەف بوو. لەلایشەوە دەستەیەکی لاوان باوەڕیان بە ئینگلیز هێنابوو. جگە لەوانە، دەستەیەکی کەمی نیشتمانپەروەر هەبوو، بێپشتیوانو گیانی نەتەوەییان بەهێز بوو"

---

[٢٣٢] هەمان سەرچاوە، ژ٨، ل٥، ٦؛ ژ٩، ل٢، ٤.

زۆربەی خەڵك و بەشێكی مامۆستایان و ئەفسەران و بەتایبەت قوتابیان سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی بیری نەتەوەیی و نیشتمانی بوون[٢٢٣].

شێخی گەورە بە سواری ئەسپ، بە یاوەریی سەید محەمەدی سەرۆكی جەباریی و ڕەفعەت بەگ و عەزیز ئاغای عەباس ئاغاو عەلی ئاغا لە سەرانی داودەو عەلی ئاغای حەسەن ئاغاو غەفوور ئاغای جاسم ئاغاو حەمە ئاغای كەریم ئاغا لە سەرانی زەنگەنەو سلێمان بەگ و فارس بەگ و محەمەد حەسوون بەگ لە سەرانی بەیات و ئەمین ئاغای ڕەشید ئاغاو عەزیز خەسرەو ئاغاو یوونس ئاغای مەحموود خدرو جەوهەر ئاغای برای لە سەرانی هەمەوەندو شێخ قادری شێخ ڕەزاو سەید عەلی و شێخ ئەمین و شێخ نەجیب و سەید خەلیل ئاغا لە شێخانی قەرە حەسەن و نزیكەی هەزار سوار، لەڕێگەی قادركەرەمەوە ڕوویكردە داریكەلی. یەكەم شەو لەناو داودە لە دێی عەزیز ئاغای عەباس ئاغا، دووەم شەو لە قادركەرەم لە ماڵی شێخ عەبدولكەریم، سێیەم شەو لە مەملەحەو چوارەم شەو لە داریكەلی لە دەوڵەتخانەی خۆی حەسایەوە. داریكەلی، بە پێشوازیكەرانی سلێمانی و دەوروبەری تەنرابوو[٢٢٤]. شێخ لەڕێگەدا مەزبەتەی بە چەندین شێخی تاڵەبانی و سەرگەورەی تر ئیمزا كرد، تا ببێتە بەڵگەنامەی داواكردنی دامەزراندنی دەوڵەتێكی كوردی بە پێشەوایەتیی خۆی[٢٢٥].

---

[٢٢٣] یادداشت، ب٦، ل١٠-١١.

[٢٢٤] هەمان سەرچاوە، ژ٩، ل٢، ٣، ٤.

[٢٢٥] كرد وترك وعرب، ص٢٧٢.

شێخ قادر ڕێوشوێنی بۆ پێشوازیی شێخی نەمر دانا؛ بە فەرمانی ئەو چوار تاقی زەفەر، لە بەر دەرگای ماڵی شێخ مەحموودو بەر دەرگای تەلگرافخانەو بەردەرگای مزگەوتی گەورەو بەر جادەی وەیس، دروست کرا، بە گوڵو ڕێحانەو شتی جوان ڕازێنرانەوە، بالآیان بە بەیداخی کوردستان نەخشین کرا. ڕۆژی ٩/٣٠ هەواڵ گەیشت کە شێخ لەدوای هەتاوکەوتنەوە لە داریکەلیەوە جووڵاوە .... عەسکەری پیادەو شاگردانی مەکتەب، هەریەکە بەیداخی کوردستان بەدەستەوە، لای چوار تاقەکە ڕیزیان بەست. دووکانو بازاڕ داخرا. خەڵكو عەشایەر بە سواریو پیادەیی تا دوو سەعاتی ڕێگە کۆمەڵ کۆمەڵ بە ڕیز لەسەر ڕێ ڕاوەستان.

((ئەو ڕۆژە لەلایەکەوە گریانی خۆشیو هەلهەلەی شۆڕەژنانی مێخەکبەند لەملو هەیاسە لەپشت، لەولای کەوە گوڵبارانو قریوەی کچۆڵە خنجیلانەو ئێسلسووکەکانی پەنجە خەناوی فرمێسکی شادی بە چاوەکاندا ئەهێنایە خوارەوە. سلێمانی بووبوو بە مەحشەر. هەزاران پیاوو ژن بە چەپڵەرێزانو دەنگی هەر بژی، هەزاران قوتابی کوڕو کچ بە بەرگی نەورۆزی کوردەوە گۆرانی نیشتمانیو نەشیدەی بەخێرهاتنەوەیان ئەخوێندەوە. چریکەی شێرانەی زابتەکانی کوردو سیرەی هەڵکێشانی شیرە بریقەدارەکانیان، شەقەشەقی تفەنگ لەسەرشانی عەسکەر، قرەی ئوتومبیل، تەقو هۆڕی شێلکی دەمانچەو هارەی دەسڕێژی سوارەی عەشایەر، لەگەڵ ناڵەو گرمەی تۆپ گوێی ئینسانی کەڕ ئەکردو لە هۆش خۆی ئەبردەوە))[٢٢٦]. لە سەرانی پشدەر، عەباس ئاغای سەلیم ئاغاو

---

[٢٢٦] یادداشت، ب٥، ل١٠١-١٠٢.

حەسەن ئاغای بەڕێوەبەری قامیش و محەمەد ئاغای ئاغای عەلی ئاغا، پێشتر هاتبوونە سلێمانی بۆ بەخێرهێنانەوەی شێخ. شێخ مەحموود سەعات ١,٥ی پاشنیوەڕۆ گەیشتە ناو شار[٢٣٧]. خانووی میرزا فەرەجی حاجی شەریفی بۆ ساز کرا[٢٣٨].

دەستبەجێ تۆپ ئاگردرا، عەسکەرو شاگردانی مەکتەب ڕێوڕەسمی سلاویان بەجێ هێنا. شاگردان گۆرانی‌ی میللییان خوێند. ژنان و منالان لە سەربانی مالانەوە گولاوپڕژێن و گولباارانی شێخیان کرد[٢٣٩]. شێخ وەك حوکمدار یا پێشەوای کوردستانی سەربەخۆ بەخێر هێنرایەوە[٢٤٠].

((شێخ بە چەفتەو عەگالی سوورەوە لە ئەسپەکەی هاتە خوارەوە. چاوێکی بە دەوری خۆیا گێڕا. بەلام خەلق لە هۆش خۆیان چووبوون. دەنگێکی نێری شێرانە خەلقەکەی هانیەوە هۆش خۆی. زابتێکی کورد عەسکەرەکان و مامۆستایەکی نیشتمانپەروەر قوتابی‌یەکانی بۆ سەلاو وەستان. ئینجا دووبارە چەپلەڕێزانێکی دوورودرێژو گولبارانێکی ئێجگار بە

---

[٢٣٧] بانگی کوردستان، ژ٩، ل١، ٣.

[٢٣٨] یادداشت، بەشی ددوەم / ب٥، ل١٠٣ و، بەشی سێهەم، بغداد، ١٩٩٢، ل٣١؛ هەلۆ، ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی هەندێك لە باسەکانی چیم دی.

جێی وتنە، ئەو خانوە دواتر بوە هی حاجی فەتاحی برای، ئەمجا هی تۆفیق ئەفەندی‌ی ئاغا فەتحوللا، بەتەنیشت خانوەکەی میرزا تۆفیق قەزازەوەیە بەرامبەر بە مالی حاجی ئەمینی کاکەحەمە.

[٢٣٩] بانگی کوردستان، ژ٩، ل٣.

[٢٤٠] کرد وترك وعرب، ص٢٧٢.

دڵسۆزی دەسی پێ کردەوەو ئەمانە هەمووی تێکەڵ بە ئاوازی شیرینی دەستەی گۆرانی قوتابییەکان بوو))[٢٤١].

شێخ کە گەیشتە دەوڵەتخانە، دوای ١٠ دەقە پشوو، هاتە دەرەوەو میوانەکانی بەخێر هێنا. پاشان ڕەفیق حیلمی خوتبەیەکی پڕخرۆشی خوێندەوە" تانووتی تێدا لە ئینگلیز دا کە هەڵەی پێشوو دووپات نەکاتەوە، بەڵکوو پێویستە پشتی شێخ بگرێ؛ داوایشی کرد هەموان دەست بدەنە دەستی یەکترو ماوە نەدەن فریو بدرێن[٢٤٢].

شێخ نوتقێکی شیرینی فەرموو سەبارەت بە هەوڵدانی بۆ پێشکەوتنی کوردو کوردستانو خزمەتی میللەت بە گیانو دڵ. شارەوانی، شەربەتو قاوەی بەسەر میواناندا بەخشییەوە. دوای ١٥ دەقیقە، ساداتو مەشایخ، دواتر ئەشرافو دۆستانی مەملەکەتو توجارانو مەئمووران چوونە زیارەتی شێخ. ئەم زیارەتە تا سەعات ٤ی خایاند. نزیکەی هەزار سواری عەشایەر کە لە خزمەتی حوکمداردا لە (سەلاحییە)وە هاتبوون، دەستە دەستە بۆ حەوانەوەو پشوودان برانە ئەو شوێنانە کە پێشتر بە فەرمانی شێخ قادر بۆیان ئامادە کرابوو.

هەموو ڕۆژێ لە کفرییەوە تا سلێمانی چەند فڕۆکەیەك ئەهات، هەواڵی لە مێجەر نۆئێلی ڕاوێژکارو نوێنەری مەندووبی سامی وەرئەگرت کە لەگەڵ شێخدا هاتبوو.

---

[٢٤١] یادداشت، ب٥، ل١٠٢.

[٢٤٢] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ل١٠٣-١٠٤.

ڕۆژی دوای هاتنەوەی شێخ، شێخ محەمەدو شێخ سالحی کوڕانی شێخ سەعیدی گۆپتەپە هاتنە دیدەنیی. نۆئێل، "بانگی کوردستان" (وەك قونسلۆسێکی ئەجنەبی)ی میوان ناساندوویە؛ لەوخانوەدا دانیشت کە کاتی حوکمی ئینگلیزەکان موفەتیشی گوومرگی تێدابوو. پێ بەپێ ڕاگەیەندرا: مەجلیسێکی عومومی کە سەرخێڵانیشی لەناودایە، پێك هێنراوە، بۆ چەسپاندن و دابینکردنی بنەماکانی سەربەخۆیی وتووێژ ئەکرێ، ئەنجامی گفتوگۆو بڕیارەکانی مەجلیس بەهۆی نۆئێلەوە بۆ مەندووبی سامی ئەنووسرێ و وەڵام وەرئەگیرێ[243].

شێخ ویژدانی سیخناخی ئەم بیرو خەیاڵانە بوو: ئەگەر بزانێ ژیرانە گەمە بکات، دەسکەوتی زۆری بۆ کورد تێدا ئەبێ؛ لەکاتێکدا ئەبێتە خاوەنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ، ئەویش مەلیکایەتی و ناوبانگێکی نەمر بەدەست ئەهێنێ. پاشان گەلێ نەتەوەپەرستی دڵسۆزی بەدەورەوەن، کارێك ئەکەن خەونەکانی فراوانترو زیندووتر بن. ئەگەرچی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی بۆ دیاری کرابوو، بەڵام بە دوو چاوی تیژو بەهەڵپەوە ئەیڕوانییە ئەو هەرێمە کوردنشینانەی دەورووپشت کە گفتی دابوو دەست لە کاروباریان وەرنەدات[244].

نۆئێل شەوی هەینیی ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢، لەگەڵ چەند کەسێکدا، بە ئوتومبیل چووە کەرکووك. لەوێشەوە بە فڕۆکە چووە

---

[243] بانگی کوردستان، ژ٩، ل٣، ٤.

[244] يقظة الكرد، ص٢٥٨-٢٥٩.

بەغدا[245]. کاپتن چاپمانی حاکمی پێشووی چەمچەماڵ، هاتە شوێنی لە سلێمانی. نۆئێل ٩/١٠ بە فڕۆکە هاتەوە بۆ شار. هەر ئەو ماوەیە، مەفرەزەکەی جووڵانەوەی ڕەواندز کە بریتی بوو لە ٥٠-٦٠ سوارێکی پشدەری، لەگەڵ ئەحمەدی حەمەئاغای بێشیردا، بە فەرماندەیی‌ی یووزباشی فەوزی ئەفەندی گەیشتبوونە سووورداش، کتوپڕ لە ئاوی زێ پەڕینەوە بۆ ئەوبەر ڕوو بە ڕەواندز. ئینگلیز کۆیەی بەتوندی بە فڕۆکە بۆردومان کرد. بۆیە خەڵك بەناچاری جوابی مەفرەزەکەی تورکیان دا[246]، ١٩٢٢/١٠/٧ چۆڵیان کرد[247].

شێخ، دوای گەڕانەوە، چەند ڕۆژێ باری دەروونیی باش نەبوو. ڕۆژی ١٠/٨ پێشوازیی لە چەند سەرۆك عەشیرەتو میوانێکی کرد. عەلی بەگی مەحموود پاشاو کەریم بەگی فەتاح بەگو حسێن بەگی مەحموود پاشاو حامید بەگی مەجید بەگو ئەحمەد موختار بەگی وەسمان پاشاو ئەحمەدبەگی محەمەد پاشاو حسێن بەگی حەسەن بەگو ئەحمەد بەگی محەمەد سالح بەگو داود بەگی محەمەد سەعید بەگو محەمەدبەگی فەتاح بەگو شیهابول سەڵتەنە عوسمان بەگی عەبدوڵلا بەگی شەرەفبەیانی دووشەممەی ٩/١٠ هاتنە شار، زیارەتی شێخیان کرد. ئەمانەیشیان

[245] هەمان سەرچاوە، ل٢٥٨-٢٥٩.

[246] هەمان سەرچاوە، ژ٩، ل٦و، ژ١٠، ١٥ تشرين اول ١٩٢٢، ل٤؛ بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری، ل٧٣-٧٥.

[247] کرد وترك وعرب، ص٢٧٠.

لەگەڵدا بوو: کوێخا محەمەد ئیبراهیم‌و ئەحمەد مەحموودو حەمەتالیب سلێمان‌و عەلی وەیس لە شاتری، ساڵح کاکەخان‌و ڕۆستەم حەمەی مەحموودو حەمەڕەشید باباجان‌و فەتاح کامەران خەسرەوو حەمە عەلی مەحموود لە ڕۆغزادی، حەمە حەسەن‌و حەمە شاسوارو ڕۆبیتەن سەلیم ئەحمەد لە تەرخانی، عەلی محەمەد ئەمین‌و عەبدولکەریم حاجی‌و عەبدولحەمید محەمەد ئەمین لە هاروونی، خەسرەو مستەفاو کوێخا ئەحمەدی هەڵەبجە لە سەدانی، عەلی عەزیز لە نەورۆڵی‌و ڕۆستەم حەسەن حاجی قادرو عەزیز حەمەگدروون‌و میرزای حاجی حسێن‌و حسێن ئەحمەد شاسوارو حەمەی فەتاح سمایل‌و حاجی کاکە وەیس لە مکایەڵی[248].

٢. ٢. ٣. دەورانی دووەم حکوومەتی کوردستان:

شێخی گەورە کە هاتەوە، کرایە سەرۆکی (جەمعییەتی کوردستان)[249]. ئەمجا ڕۆژی ٩/١٠/١٩٢٢ یەکەم ئیرادەی علییەی حوکمداریی دەرکرد، ڕایگەیاند:

((لەپاش طەڵەبی سەعادەت‌و مەغفیرەت لە بارەگاهی ئەحەدییەت، بۆ ئەم میللەتە مەظڵوومەی خۆمە ئیعلان ئەکەم، کە لەبەر بەعضێ ئەسباب‌و عەواریضی سیاسییە موددەتێکە لە خذمەتی ئەم میللەتە صادیقەی

---

[248] بانگی کوردستان، ژ١٠، ١٥ تشرین اول ١٩٢٢، ل٢، ٤-٥.

[249] یادداشت، بەشی دووەم/ ب٦، ل٧٤، ٧٦.

کوردە دوورو مەهجوور مابووم. ئیمڕۆ لە سایەی خوداو ڕووحانییەتی مصطەفا (صلعم) و هیممەتی ئەجدادو لە سایەی نیازو تەضەڕڕوع و قووەتی ئەم میللەتە صادیقەوە گەیشتمە ئەم ڕۆژە موقەددەسەی کە مووەفەقەن هاتوومەوەو لە ئیمڕۆوە دەستم کردەوە بە تەدویری پەروانەی حکوومەت و موحافەظەی مەوجوودییەت و ئیستیقلالییەتی کوردستان. ئومێدو ئارەزوو ئەکەم هەمووتان بە یەک غایەو مەسلەک و بێفاصیلە سەعی بۆ دەوامی ئەم ڕۆژەو کۆشش بۆ تەعالی ئەم میللەتە ئەکەن. کورد ! وەکوو یەک عائیلە موتتەفیقەن و موتتەحیدەن لەگەڵ مندا بۆ تەحکیم و دەوامی ئەم حەقە صەریحەیە کە دەستمان کەوتووە لازم و فەرضە سەعی و غیرەت بکەین. ئەی میللەتم ! ئەمین بن کە ضامنی سەعادەت و مووەفەقییەتی ئەقوام ئیتیحادو ئیتتیفاقە. وە میللەتێ کە خوێنی ڕشتبێ بۆ حەقی خۆی قەطعییەن مەحرووم و ئەسیر نابێ و قەراری عالەمی مەدەنییەتیش ئەمەیە کە هەر قەومێ و هەر عونصورێ خۆی بە خۆی ئەبێ ئیدارە بکات. ئەووەڵەن ئێمە کە میللەتی کوردین ثانییەن بۆ ئەم غایەیە قوربانییەکی زۆرمان دا، بە ئەو شەرطە کە یەکدڵ و یەک وجوود بین بە ئیذنی خودا هیچ کەس ظەفەرمان پێ نابا، وە منیش تا ئاخر قەطرەی خوێن و ماڵ خۆم و ئەولادو ئەتباعم بۆ سەعادەتی ئێوە صەرفم کردبوو و تیکرار ئەیکەم. هیممەت لە ئێوە مووەفەقییەت لە خودا))[٢٥٠].

شێخ دووەم ئیرادەی لە ١٠/١٠دا دەرکرد سەبارەت بە پێکهێنانی کابینەی حکوومەتی کوردستان لەم ناوانە:

---

[٢٥٠] بانگی کوردستان، ژ١٠، ل١.

شێخ قادری حەفید– سوپاهسالار، شێخ محەمەد غەریب– ڕەئیسی داخلییە، عەبدولکەریمی عەلەکە– ڕەئیسی مالییە، میرلیوا مستەفا پاشا– ڕەئیسی مەعاریف، ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ– ڕەئیسی گوومرگ، محەمەد ئاغای عەبدوڕڕەحمان ئاغا– ڕەئیسی نافیعە، سەید ئەحمەدی بەرزنجی– ڕەئیسی ئەمنییەتی عومومییە، میرلیوا سدیق پاشای قادری– موفەتیشی عومومی‌ی حکوومەتی کوردستان[251].

ئەمە ناوی کارمەندانی ڕیاسەتەکانە:

نافیعە: کاتب–عەلی باقی ئەفەندی‌و سدیق ئەفەندی ، ڕەئیسی موهەندیسخانە– ماجد مستەفا ئەفەندی، مەئمووری تەلغراف– حسێن ئەفەندی.

مالییە: سەرموحاسیب– سالح پاشا، کاتب– فارس ئەفەندی ئیسماعیل ئاغا و سالح ئەفەندی‌و مەجید ئەفەندی‌و تۆفیق ئەفەندی‌و قوتبەددین ئەفەندی‌و عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی؛ سەرکاتبی ڕسوومات– عەبدوڵڵا ئەفەندی، کاتبی دەیەك– شێخ عەزیز ئەفەندی، ڕێژی– عەلی بەگ‌و محەمەد ئەفەندی‌و مەعرووف ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی.

داخلییە: سەرکاتب– مستەفا ئەفەندی، کاتب– سەعید ئەفەندی‌و ڕەشید ئەفەندی، قوماندانی ژاندرمە– شێخ مستەفا؛ بەلەدییە: ڕەئیس– مەحموود ئەفەندی‌ی قادر ئاغا، سەرکاتب– شێخ نووری ئەفەندی، کاتب– عەلی ئەفەندی، موهەندیس– قادر ئەفەندی؛ بەڕێوەبەری تاپۆ– ئەحمەد

---

[251] هەمان سەرچاوەو ژمارە، ل1–2.

فایەق بەگ، موعاوینی تاپۆ- هادی ئەفەندی، کارمەندانی تاپۆ- ئەحمەد بەگو مەلا سەعید ئەفەندیو عەلی بەگو غەفوور ئەفەندی؛ بەڕێوەبەری سەنگاو- شێخ عەبدولقادری گوڵلەنەبڕ.عەدلییە: ڕەئیسی ئیجرا- سدیق مەزهەر ئەفەندی، قازی- مەلا مەعرووف ئەفەندی شێخ ڕەسووڵی سیری، ئەندامی مەحکەمە- نەجیب ئەفەندی، مەئمووری ئیجرا- عەلی سامی ئەفەندی[٢٥٢]، بەڕێوەبەری هەتیوخانە- سەید ئەحمەد ئەفەندی، سەرکاتبی مەحکەمە- محەمەد وەهبی ئەفەندی، کاتبی مەحکەمە- شێخ ڕەشید ئەفەندیو ئەحمەد ئەفەندیو خەلیل ئەفەندی.

دائیرەی قوماندانی عەسکەری کوردستان- ساڵح زەکی ساحێبقڕان، مولحەقی قوماندانی عەسکەری- فایەق حیلمی بەگ، مولازمی یەکەم- ئەمین بەگ ڕەواندزی، مولازمی یەکەم- یوونس ماهی ئەفەندی، ڕەئیسی شوعبەی ٣ی دائیرەی قوماندانی عەسکەری- مولازم عەزیز حیکەت قەزاز، مولازمی دووەم- ئیبراهیم ئەفەندیو حیکەت ئەمین ئەفەندیو ڕەشید ئەفەندیو ڕەمزی عەبدولکەیم ئەفەندیو فەتاح ئەفەندی، مەئمووری حیساب- ڕەشید ئەفەندی، بەڕێوەبەری شوعبەی ٢ی قوماندانی عەسکەری= ڕەئووف ئەفەندی حیلمی، قوماندانی تابووری پیادە- عەبدولقادر ئەفەندی[٢٥٣]. ئەم دائیرەیە خەستەخانەیەکی عەسکەریشی بۆ

---

[٢٥٢] پێشتر مەئمووری ئیجرا بووە لە ئەستەموول، بە فەرمانی ڕەئیسی داخلییە ئەو وەزیفە نوێیەی دراوەتێ ( ڕۆژی کوردستان، ژ٣، ل٤).

[٢٥٣] ڕۆژی کوردستان، ژ٨، ١٠ کانون ثانی ١٣٣٨، ل١-٣؛ ژ١٢، ١٠ شباط ١٣٣٨، ل١-٣.

عەسکەرە نەخۆشەکان هەبوە، ڕەئووف حیلمی بەڕێوەبەرو جێی کەم‌وزۆر ٢٥ نەخۆشی تێدا بوەتەوە[٢٥٤].

ڕەسووڵ ناجی ئەفەندی کە مەئمووری دەیەك بوو لە هەڵەبجە، کرایە کاتب لای وەکیلی مەندووبی سامی لە سلێمانی[٢٥٥].

فڕۆکەکانی ئینگلیز لەو ڕۆژانەدا پێنج دێی ناحیەی شێخ بزێنی‌یان بۆردومان کرد، ئەمجا سێسەد سوار لەکەرکووکەوە چوون ئەو دێیانەیان سووتاند. لەوەبەدوا دوانزە فڕۆکە چوونە سەر دەوری ڕانیە، هەشتا ئەسپیان بە مەترالیۆز کوشت[٢٥٦]. ئەو ناوچانە لەژێر دەستی جووڵانەوەی ڕەواندزدا بوون.

کە ڕیاسەتەکان کەوتنە کاروبار هەڵسووڕاندن، شێخ قادری نائیبی حکوومەت ١٢ی تشرینی یەکەم لە ئاگاداریی ژمارە (١٤)یدا بڵاوی کردەوە کە دەوامی دائیرەکان لە ڕۆژی ١٠/١٤ بەدواوە: بەیانیان لە سەعات ٣-٦ی عەرەبی (١٠-١ی ئینگلیزی)و پاشنیوەڕوان لە ٨-١١عەرەبی (٣-٦ی ئینگلیزی) ئەبێ[٢٥٧].

---

[٢٥٤] نووسراوێکی ڕەسمیی ئەو دائیرەیە کە تایبەتە بە کرینی ٢٥ مێزی نانخواردن بۆ خەستەخانەکەو لەلای بنەماڵەی خوالێخۆشبوو شێخ ڕەئووفی شێخ مەحموود پارێزراوە، بەڵگەی ئەوەیە.

[٢٥٥] بانگی کوردستان، ژ١٠، ل٤.

[٢٥٦] هەمان سەرچاوە، ژ١٠، ل٤؛ ژ١١، ٢٠ تشرین اول ١٩٢٢، ل٣.

[٢٥٧] هەمان سەرچاوە، ژ١٠، ل٦.

هەر ئەومانگە، مەحموود خانی دزلّیو ئامۆزایانی، عەلی محەمەد خانو محەمەدڕەشید بەگی کوڕانی جانۆڵا بەگو عەبدوڵابەگی سەرتیپو محەمدعەلی بەگی حەبیبوڵا بەگو محەمەد عەلی بەگی سەردار بەگ، بە سەد سوارەوە هاتنە سلێمانی بۆ سەردانی شێخ، لە خانووی عەبدوڕڕەحمان قەفتان دابەزین[٢٥٨].

نۆئێل لە نامەی ڕۆژی ١٩٢٢/١٠/١٠یدا بۆ بۆردیلیۆنی سکرتێری مەندووبی سامی نووسیویە: ((وای بۆ ئەچم بڕیاری ئەوە درابێ کە کورد، پێی خۆش یا ناخۆش بێ، ئەبێ بە هەموو جۆرێ خوارووی کوردستان بخرێتە سەر عیراق و لەژێر دەسەڵاتی عێراقدا بێ. جارێکی تریش دووبارەی ئەکەمەوە کە کورد نابێ بخرێتە ناو عیراق. ئەگەر کەرکووك بکرێ بە ناوچەی ئینتیخابات بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی دامەزرێن، مانای وایە بە کوردەکان بوترێ بە ئاشکرا بڕیاردراوە کەرکووك بخرێتە سەر عیراق))[٢٥٩].

شێخ، ١٠/١٥ سێیەم ئیرادەی حوکمداریی بڵاوکردەوە کە هەشت ڕێنوێنییە بۆ ڕوئەساو ڕیاسەتەکان لەبارەی بەڕێوەبردنی دائیرەکانەوە. نۆئێلیش ١٠/١٨ بە فڕۆکە چووەوە بۆ کەرکووك، چاپمان جێی گرتەوە؛ ١٠/٢٣ بە فڕۆکە لە کەرکووکەوە گەیشتەجێ، لەگەڵ "چاپمان"دا چاویان

---

[٢٥٨] هەمان سەرچاوە، ژ١١، ل٥.

[٢٥٩] م. ر. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب٢، ل٤٨٤.

بە شێخ کەوت، ئێوارە دیسان بە فڕۆکە ڕووی کردەوە کەرکووک. ئەو سەروبەندە شێخ بۆ شکار چووە قەزای شارباژێڕ، ۱۰/۲۲ گەڕایەوە[٢٦٠].

هێزەکانی ئینگلیز لە هەوڵی بەرتەسککردنەوەی ناوچەکانی ژێر ڕکێفی جووڵانەوەی ڕەواندزدا بوون. ڕۆژی ۱۰/۲۷ (مەرگە) بۆردومان کرا. فڕۆکەکانی بریستۆل و سنایپ چەندەها حەفتە ڕۆژانە لە مەرگەوە تا دێهاتە نەیارەکانی پشدەرو دۆڵی شاور بۆمبابارانیان ئەکرد[٢٦١].

شێخ عەبدوڵلای عەسکەرو تاقمێك و شێخ غەفوورو شێخ قادر، عەباس ئاغای مەحموود ئاغای پشدەر بە سێسەد سوارەوەو بایز ئاغاو پیرۆت ئاغاو خدر ئاغای کوڕانی حاجی ڕەسووڵ ئاغاو بابەکر ئاغای خدر ئاغاو گولاوی ئاغاو باپیر ئاغای بابەکر ئاغاو ئاغای قەرەنی ئاغاو ئەحمەد ئاغای جوامێر ئاغاو قادر ئاغای مستەفا ئاغاو شێخ ئەمینی سپیدارە؛ لە بەگزادەکانی وەڵەدبەگیش ئەحمەد بەگی ڕیشێن و محەمەد عەلی بەگی کوڕی و محەمەدسەعید بەگی حەسەن بەگی ئامۆزای، حەسەن و ڕۆستەم بەگی کوڕانی یارئەحمەد بەگ، شێخ محەمەدی شێخ حیسامەدین، بۆ بەخێرهێنانەوەی شێخ هاتنە سلێمانی[٢٦٢].

فڕۆکەکانی ئینگلیز ئەو سەروبەندە چوونە سەر مەرگەو قەڵادزێ و دەروپشتی ڕانیە، زیانی ماددی و گیانییان بە خەڵك و ئاژەڵەکانیان

---

[٢٦٠] بانگی کوردستان، ژ۱۱، ل٦؛ ژ۱۲، ل۱-۲، ٦.

[٢٦١] کرد وترك وعرب، ص۲۷۱.

[٢٦٢] بانگی کوردستان، ژ۱۱، ۲۰ تشرین اول ۱۹۲۲، ل٥؛ ژ۱۲، ۲۷ تشرین اول ۱۹۲۲، ل٦.

گەیاند[٢٦٣]. "بانگی کوردستان" لە کۆتایی‌ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا نووسیویە: ((لە مەرکەزی حکوومەتی کوردستان یەعنی سلێمانی‌دا لە سایەی هیممەت‌و عەزمی ئولول ئەمرەوە لە الحمد ئاسایش‌و ئەمنییەتی تەواو هەیەو لە ئەطرافیشدا دیسان ئیختیلافات ڕووی بە دۆستی گرتووە ئەم حاڵە بۆ هەموو کوردان موجیبی شوکرانە))[٢٦٤].

قوتابخانەکانی مەعاریف بەم شێوەیە ڕێك خرانەوە؛

ئەعدادی‌ی مەحموودی‌ی حەوت پۆلی:

ڕەفیق حیلمی کرایە بەڕێوەبەری بە مانگانەی ٢٥٠ ڕووپیە، موعەللیم-ساڵح ڕەفعەت‌و سەعید سدقی‌و زێوەرو ئەحمەد حەمدی‌و محەمەد ڕەمزی‌و محەمەد زوهدی‌و سەعید ئەدیب قەزازو ساڵح قەفتان‌و ئەمین ئەفەندی‌و مەلا مەحموودی بێخودو جەلال ئەفەندی صائیب‌و حەمدی بەگ. ڕوشدیەی قادرییە: سەعید زەکی فەتاح بووە موعەللیمی ئەووەڵ، موعەللیم-عەبدولعەزیز عوسمان‌و عەزیز ئەفەندی‌و مەلا سەعیدو ڕەشید ئەفەندی‌و عەبدوڵڵا ئەفەندی‌و حەمەکاکە ئەفەندی. ئیبتیدائییەی ڕەئووفییە- سەید عاکیف کرایە موعەللیمی ئەووەڵ، موعەللیم- ئەحمەد. ئیبتیدائییەی لەتیفییە- ئەحمەد حەمدی (عەزیز ئاغا) بووە موعەللیمی ئەووەڵ، موعەللیم- شێخ ئەحمەدو شێخ سەعید[٢٦٥].

---

[٢٦٣] هەمان سەرچاوە، ژ١٢، ٢٧ تشرین اول ١٩٢٢، ل٣.

[٢٦٤] هەمان سەرچاوە، ژ١٢، ل٦.

[٢٦٥] بانگی کوردستان، ژ١٢، ل٦؛ ژ١٣، ٣ تشرین ثانی ١٩٢٢، ل٢؛ ڕۆژی کوردستان، ژ١٢، ١٠ شباط ١٣٣٨، ل١-٣.

ئەفسەرانی کورد، سەرباری ئەرکی عەسکەرییان، بەپەرۆشەوە هاوکاریی قوتابخانەکانیان ئەکردو دەرسیان تێدا ئەوتەوە. ئەمین ڕەواندزیو عەزیز حیکمەت قەزاز، دەرسی یاریو مەشقی عەسکەرییان فێری قوتابیەکان ئەکرد. سدیق پاشا قادری، هەموو ڕۆژێك ئەچوە دەرسی ڕەسمەوە. مستەفا پاشای ڕەئیسی مەعاریف، خۆیشی دوای دەست لەکارهەڵگرتنی ڕەشید کابان، دەرسی جەبری لە ئەعدادیی مەحموودیدا ئەوتەوە. قوتابخانەکان کە دەوری ٨٠٠ قوتابییەکیان هەبوو، بەرگی قوتابییان تێدا کرا بە یەك شێوەو ڕەنگ، کڵاوی سەریشیان بە سورمە، هێندێ قوتابیی دەوڵەمەندیش بە ئاڵتوون، وشەی (مەحموودی، قادرییە، لەتیفییە، ڕەئووفییە)یان پێدا دادروو[266].

نووزدەمین دووەم نیوەی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ فەوزی بەگی یووزباشیی، بە یاوەریو چاوساغیی ئەحمەدی حەمەئاغای بێشین، نارده سلێمانی بۆ تێگەیشتنی لە مەبەستو نیازەکانی شێخ مەحموود. ئەوان، لەلای دێی (کەڵەکن)ی نزیکی باکووری ڕۆژئاوای شار شێخیان بینی؛ شێخ پێی ڕاگەیاند کە هێنرانەوەی بۆ ئەوەیە تورکەکان لە ڕەواندز دەرپەڕێنێ یا بۆی چۆڵ بکەن، لە پێینی ئەوەدا کە کەرکووكو هەلێر تا ئاکرێو سەرتاسەری کوردستانی

---

شایانی باسە، ڕەشید زەکی کابانی بەڕێوەبەری پێشووی قوتابخانەی نموونەی سەعادەت، ئەو دەورانە بە ئیرادەی حوکمداری بوو بە موعەللیمی ئەووەلی ڕوشدیەی قادرییە، بەڵام نەیکردو دەستی کێشایەوە. لەوبارەیەوە بڕوانە: سدیق ساڵح، ڕەشید کابان نوێنەرێکی کوردستانی باشوور (ساڵی ١٩١٩)، "پەیڤین"، ژ٤، دیسەمبەری ١٩٩٨.

[266] یادداشت، ب٦، ل٦-٧، ٩.

جنووبیی بخەنە ژێر دەست. بۆیە ئەگەر ئەوان هێزیان هەیە هاوکارییان ئەکات تا چیای حەمرین بگرن؛ ئەگەر نییانە ئامادەیە سلێمانی بەجێ بهێڵێ‌و کوێیان پێ باشە لەوێ دابنیشێ؛ ئەگەر ئەوەیش ناکرێ، چەك‌و جبەخانەو ئەفسەری بەکاری بۆ بنێرن، خۆی ئەوە ئەکات" ئەگەر ئەو سێ پێشنیارەیشیان پێ جێبەجێ ناکرێ، جارێ بکشێنەوە ناو تورکیا تا دواتر پێکەوە سازوتەیار ئەبن بۆ شەڕی ئینگلیز. هەروها بە ڕاشکاوی دانی پێدانا کە بڕوای بە ئینگلیزو بەڵێنەکانی نییە، ئامادەیە، بە هەر ڕێگەیەك بێ، هاوکاریی تورك بکات بۆ لێدانی ئینگلیزو پاککردنەوەی ناوچەکانی تا چیای حەمرین لێیان[٢٦٧].

هەواڵگریی بریتانیش مانگێك دوای گەیشتنە جێی شێخ، زانیاریی دروستی چنگ کەوت لەوبارەیەوە کە شێخ پەیوەندیی بە ئووزدەمیرەوە هەیەو وەفدێکی ناردەوەتە لای بۆ کۆمەك پەیداکردن.

٢١ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ مستەفا بەگی عەبدوڵڵا بەگی عوسمان پاشا کرایە بەڕێوەبەری فەوقلعادەی ناحیەی پێنجوێن بە مانگی ٣٠٠ ڕووپیە[٢٦٨].

---

[٢٦٧] یادداشت، بەشی دووەم / ب٦، ل٦٩-٧٤؛ بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری، ل٨٠-٨٣.

جێی وتنە، مادام ئووزدەمیر، لە یەکەم سەرچاوەیاندا، ئەو دوو نامەیەی سەبارەت بەو سەفەرەی فەوزی بەگ لە ١١/١ و ١١/٣دا ناردووە بۆ قوماندانی بەرەکانی ڕۆژهەلات‌و جزیرە، ئەبێ سەفەرەکەی فەوزی بەگ پێش ئەو مێژووە، کەم‌وزۆر لە دووەم نیوەی مانگی پێشوو (تشرینی یەکەم)دا بووبێ.

[٢٦٨] بانگی کوردستان، ژ١٢، ٢٧ تشرین ثانی ١٩٢٢، ل٢.

سەرەتای تشرینی دووەمی ١٩٢٢، ڕیاسەتی ئەمنییەتی عموومییە بڵاوی کردەوە کە: هەیئەتی ڕوئەسا تەشکیلاتێکی کاتییە تا مەندووبی سامی، وەك گفتی داوە، سەرجەمی لیواو قەزاکانی کوردستان ئەخاتە سەر حوکمداری.

ئەوسا تەشکیلاتێکی هەمیشەیی لە گەورەپیاوانی کەرکووك‌و هەولێرو زاخۆو ئاکرێ‌و ئامێدی‌و دهۆك‌و کفری‌و خانەقین‌و ناوچەکانی تری کوردستان پێك ئەهێنرێ.

ئەو ڕاگەیاندنە، شێخی حوکمداری کوردستانی بە حەزرەتی (مەحموودی ئەووەل) ناوبردووە. هەر ئەو ڕیاسەتە لە (تەشەکورو بەیانی مەمنوونییەت)دا ڕایگەیاندووە:

((مەندووبی سامی بۆ ناردنەوەی حەضرەتی حوکمداری کوردستان دام شەوکەتە بەذلی هیممەتی فەرموو ئێستایش بۆ ئینتیظامی حکوومەتی کوردستان‌و ئیلحاقکردنی ئەو جێگایانەی کە داخڵی کوردستانن بە سلێمانی مەشغووڵە))[269]. نۆئێل‌و ئەدمۆندزیشی وا ناساندووە: ((زۆر خێرخواهی میللەتی کوردن‌و بۆ تەرەقیی حکوومەتی علییەی کوردستان سەعی‌و کۆشش ئەفەرموون))[270]. شێخ لە ١٠ی تشرینی دووەمدا ناوی (مەلیکی کوردستان)ی لە خۆی نا[271].

ڕیاسەتی شەرع‌و عەدل کە هێشتا بێ‌ڕەئیس بوو، ئەحمەد موختار قازی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای هەولێری بەوەکالەت بەڕێوەی ئەبرد، بە

---

[269] هەمان سەرچاوە، ژ١٣، ٣ تشرین ثانی ١٩٢٢، ل٣.

[270] هەمان سەرچاوە، ژ١٣، ٣ تشرین ثانی ١٩٢٢، ل٢-٣.

[271] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص٢٥٥؛ چیم دی، ب١، ل١٢٦.

ئیرادەی حوکمداری، شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدوڕڕەحمانی قەرەداغیی دانیشتووی بەغدای بۆ دانرا. بەڵام شێخ عەلی نەیکرد[٢٧٢]. بۆیە هەر ئەحمەد موختار قازی، لە دووەم نیوەی کانونی یەکەمی ١٩٢٢ بەدوایشەوە مەلا مەعرووف وەهبی تا کۆتاییی ئەو دووەم حکوومەتەی کوردستان، وەك وەکیلی ڕەئیسی شەرعو عەدل لەو وەزیفەیەدا مایەوە[٢٧٣].

چاپخانەکەی حکوومەت (بەلەدییە)، جگە لە چاپکردنی ڕۆژنامەی "بانگی کوردستان" کە لە ژمارە ١٣ی ڕۆژی ١٩٢٢/١١/٣دا وەستێنرا، چونکە مستەفا پاشای خاوەنی، ڕەئیسی مەعاریف بوو، لەبەر سەرقاڵی پێی بەڕێوە نەئەبرا؛ پاشان "ڕۆژی کوردستان" ئیمتیازو ئیدارەخانەکەی بە ئیرادەی شاهانە درایە شێخ نووریی شێخ ساڵح، "عەلی کەمال باپیر"یش موحەڕڕیری بوو، یەکەم ژمارەی ١٩٢٢/١١/١٥ دەرچوو؛ ئەوراقی دائیرەکانو چەند کتێبۆکەیەکی تریشی پێ لەچاپ دران، لەوانە:

– تەعلیمی طاقم، ١٩٢٢، ٩ل، (١٦،٥×٢١،٥سم).
– تەعلیمی قەطعە، ١٩٢٢.

---

[٢٧٢] بانگی کوردستان، ژ١٣، ل٣؛ میر بصري، اعلام الکرد، ط١، لندن– قبرص، دیسمبر ١٩٩١، ص١٢٠.

[٢٧٣] ڕۆژی کوردستان، ژ٩، ١٧ کانون ثانی ١٣٣٨، ل٤؛ ژ١٢، ١٠ شباط ١٣٣٨، ل٢؛ سدیق ساڵح ، بەڵگەنامەیەکی دووەم حکوومەتی کوردستانی باشوور، "هەزارمێرد"، ژ٦، کانوونی یەکەم ١٩٩٨، ل١٢٠–١٢٥.

- قانوونی وەظیفەی مەجلیسی ناحییە، ١٩٢٣، ١٤ل، (١٠,١× ١٧,٧سم)[٢٧٤].

- دەستووری مووچەخۆری، ١٩٢٣، ١٤ل، (١٤×٢٠سم)[٢٧٥].

ئەو دوانەی هەووەڵ، تۆفیق وەهبی کردوونیە کوردی، هەر ئەبێ لە تورکییەوە بووبێ[٢٧٦].

ئەمانەیش ئەو ڕۆژگارە دەستەی هەڵسووڕاندنی چاپخانەکە بوون:

١- شێخ عەبدولمەجیدی شێخ عارف- بەڕێوەبەر.

٢- محەمەد ئەدیب عەزیز- سەرمورەتیب.

٣- محەمەد تۆفیق- مورەتیب.

٤- محەمەد تەییب شێخ عارف- ماکینەچی[٢٧٧].

شێخی گەورە لە ئاگادارییەکی ڕەسمی ی ڕۆژی ٢٩/١٠/١٩٢٢دا، بۆ هەموو ئاغاو کوێخاو ئەهالی ی دێهاتی کوردستان، وتوویە: ((ئەمڕۆ ڕۆژی

---

[٢٧٤] سی.جەی. ئەدمۆندز، بیبلیۆگرافیای چاپکراوی کوردیی باشوور (١٩٢٠-١٩٣٦)، گۆڤاری Jornal of the Royal Central Asian ، لەندەن، بەرگی ٢٥، بەشی ٣، تەمووزی ١٩٣٧ و، هەمان بیبلیۆگرافیای (١٩٣٧-١٩٤٤)، هەمان گۆڤار، بەرگی ٣٢، بەشی ٢، مایسی ١٩٤٥ / بە ئینگلیزی.

[٢٧٥] مستەفا نەریمان، ببلیۆگرافیای کتێبی کوردی ١٧٨٧-١٩٧٥، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد- بەغدا، ١٩٧٧، ل٢١.

[٢٧٦] توفیق وهبي، حول مقال مسؤولیة الادیب الکردي الکبری للاستاذ عبدالمجید لطفي، بغداد، ١٩٧٣، ص٩-١٠(عني بنشره محمد الملا عبدالکریم).

[٢٧٧] ڕۆژی کوردستان، ژ١٢، ل٢.

برایەتی و دۆستی و خزمەتی دین و میللەتە ... لە حدوودو سنووری هەر دێهاتێ دزی و جەردەیی و سایرە ڕوویدات، ئەو دێهاتە تەضمین ئەکرێ و ئەهالی ئەو جێگایانە تەجزیە ئەکرێ. فاعیلەکەشی کە دۆزرایەوە بە نەوعێ تەجزیە ئەکرێ کە ببێ بە عیبرەت بۆ خۆی و بۆ هەموو عالەم و حەتتا طەیارەش سەوق ئەکرێتە سەر ئەم نەوعە جێگایانە کە بۆمبابارمانیان بکات))[٢٧٨]. دامەزاندنی ڕیاسەتەکانی حکوومەتی کوردستان، شۆڤێنیە عەرەبەکانی لە بەغدا وروورژاند. بۆ نموونە، غەزەتەی "العراق" لە ژمارەکانی ٧٣٨ و٧٤٣یدا، لە زمانی (حزب الحر العراقي)یەوە، داوای پاراستنی هەموو ماف و سنوورە ئاساییەکانی عیراقی لە حکوومەتی خۆیان کردووە، کوردستانیشی بەناوی لیوای سلێمانییەوە خستوەتە سەر. عارف صائیب لێی هاتوەتە دەنگ، کوردستانی بە دەوڵەت و وڵاتێکی جیاو دراوسێی عیراق لەقەڵەم داوە. بە هەمان مەرامەوە، وەڵامی هەواڵێکی لەو چەشنەی ڕۆژنامەی "دجلە"ی داوەتەوە کە لە "نەجمە"وە وەریگرتووە[٢٧٩].

شێخ، لەو مووچەیە کە هەیئەتی ڕوئەسای کوردستان بۆی بڕییەوە، لەبەر قازانجی گشتی و کۆمەکی خەزێنەی میللەت، ١٠ هەزار ڕووپیەی گێڕایەوە. فەرمانیشی دا هەموو وەختێ لە موڵك و سامانی تایبەتی خۆی، یارمەتیی خەزێنە بدرێ. ئەم ئیرادانەیشی لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢دا دەرکرد: شێخ قادر کرایە ڕەئیسول ڕوئەساو نایبی حکوومەتی

---

[٢٧٨] بانگی کوردستان، ژ١٣، ل٢.

[٢٧٩] ڕۆژی کوردستان، ژ١، ١٥ تشرین ثانی ١٩٢٢، ل١-٢؛ ژ٣، ٦ کانون اول ١٢٣٨، ل١-٢.

کوردستان، ماجد مستەفا بە مودیری هەندەسەخانەو سدیق ئەفەندی بە کاتبی هەندەسەخانە، تۆفیق ئەفەندیی عەزیز ئاغا بە مەئمووری ئەنبارو مەغازەی عەسکەرییەو پۆلیس، شاکر مەجروم بە موفەتیشی فەننی تەلغراف و موعامەلاتی پۆستە[280].

بینباشی سالح زەکی ساحێبقڕانی قایمقامی پێشووی ئاکرێ، یەکەم حەفتەی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ لە هەولێرەوە هاتەوە بۆ سلێمانی. ئەمانەیش دوابەدوا هاتن: یووزباشی سەید ڕەئووف لە کەرکووکەوەو داودبەگی برای سالح زەکی لە هەولێرەوە. سالح زەکی بوو بە قوماندانی عەسکەری کوردستان[281]. مولازم ڕەشید شەوقی لە هەولێرەوە هات، کرایە ئەفسەری سوارەی خاصە[282]. ئەم ئیرادانەیش لەو ماوەیەدا دەرچوون:

عەلی ئاغای سەرۆکی زەنگەنەو ڕەفعەت بەگی سەرۆکی داودەو قیدەملی ئەرکانی جەنگ یووزباشی تۆفیق وەهبی بەگ، کرانە یاوەرانی حەزرەتی ملووکانە، تاهیر ئەمین ئەفەندی بە سەرکاتبی مابەینی ملووکانە، عیززەت ئەفەندیی شێخ قادر بە ڕەئیسول ئومەناو شێخ محێدینی کانی کەوەیی بە قوماندانی قیوای میللییەی مەعییەتی ملووکانە[283].

---

[280] هەمان سەرچاوە، ژ١، ل٢-٣.

[281] ڕۆژی کوردستان، ژ١، ١٥ تشرین ثانی ١٣٣٨، ل٤.

[282] بەسەرهاتووی کاکەڕەشید شەوقی، ل٤٩.

[283] هەمان سەرچاوە، ژ٣، ٦ کانون اول ١٣٣٨، ل٤؛ ژ٤، ١٣ کانون اول ١٣٣٨، ل٣-٤.

ئەم ئەفسەرانە لە سوپای لیڤی‌ی پێشوو مابوونەوەو خرانە ناو عەسکەری کوردستان: یوونس عەبدولقادر "ماهی"و ڕەشید عەبدولکەریم‌و ڕەمزی عەبدولکەریم‌و ڕەشید سدقی غەفوورو ئیبراهیم نووری‌و محەمەد ئەفەندی‌و عەبدوڵلا عادیل شێخ قادرو سالح ڕەفعەت. ئەمانەیش پەیوەندییان کرد: یووزباشی قادر ئەفەندی‌ی قەرەداخی‌و سەید ڕەزا ئەفەندی‌و مەجید بەگی ڕەسووڵ بەگی موغاغ‌و یووزباشی سەید ڕەئووف ئەفەندی‌و سەبری ئەفەندی کاکەڕەش‌و ڕەشید شەوقی[٢٨٤].

لە (ئیعلان)ێکی بڵاوکراوەی ئەو ڕۆژگارەدا وتراوە: (( لەبەر ئەوەی کە مەقامی حەضرەتی ملووکانە بە ئومووراتی جوزئی ئیشغال نەکرێ لەمەولا ئیستیدعا بۆ ئەو مەقام عالییە بە صوورەتی قەطعی مەمنووعە هەچ کەس خیلافی ئەم ئیعلانە حەرەکەت بکا جەزا ئەدرێ))[٢٨٥].

نۆئێل، دوای چەند هاتن‌و چوونێکی نێوان سلێمانی‌و بەغداو کەرکووك‌و ئاڵوگۆڕی بیروڕای هەردوو لایەنی کوردی‌و ئینگلیزی بۆ چارەسەری کێشەی کورد[٢٨٦]، لە نامەی ڕۆژی ١٩٢٢/١١/١٥یدا بۆ شێخ مەحموودی نووسیوە کە: حکوومەتانی بریتانیاو عیراق بەتەمان بەڵێن بدەن کورد حکوومەتێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی عیراقدا پێك بهێنێ، چوونی نوێنەری کوردیشی بۆ

---

[٢٨٤] چیم دی، ب١، ل١٢٤؛ سدیق سالح، بەسەرهاتووی کاکەڕەشید شەوقی، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٤٩.

[٢٨٥] هەمان سەرچاوە، ژ١، ل٤.

[٢٨٦] بانگی کوردستان، ژ١٠، ١٥ تشرین اول ١٩٢٢، ل٤؛ ژ١١، ٢٠ تشرين اول، ل٦؛ ژ١٢، ٢٧ تشرين اول ١٠٢٢، ل٦.

بەغدا بۆ ئەو مەبەستە پێویست بینیوە[٢٨٧]. هەر نۆئێل لە ڕاپۆرتی ١٩٢٢/١١/٢١یدا بۆ مەندووبی سامیی نووسیوە: ((شێخ بە هیچ جۆرێك ڕازی نییە بە دەسەڵاتدارێتیی عیراق بەسەر کوردستانەوە. زۆر لە هەولێریەکانیش لایەنگری شێخن، شێخیش ئەتوانێ ناوچەکەی خۆی بە داهاتی بەرهەمی تووتن بژێنێ))[٢٨٨]. نۆئێل و وەفدی سلێمانی، سەرەتای کانوونی یەکەمی ١٩٢٢، لە بەغدا لەگەڵ مەندووبی سامی و مەلیك فیسەڵدا کۆبوونەوە[٢٨٩].

تشرینی دووەمی ١٩٢٢ وەفدێکی شێخ گەیشتە بەغدا، تا زەمینە خۆش بکرێ بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ شێخدا، شێوەی پەیوەندیی نێوان سلێمانی و عیراقیش دیاری بکرێ. هیچ ئەنجامێك بەدەست نەهات، چونکە داواکانی شێخ قسەهەڵنەگر بوون. وەفدەکە گەڕایەوە[٢٩٠].

شێخ بۆ ئەوەی دەسەڵاتی حکوومەتەکەی لە دەرەوەی سلێمانی بچەسپێنێ، شێخ محەمەدغەریبی ڕەئیسی داخلییەی نایبی ڕەئیسول ڕوئەسای لە کانوونی یەکەمدا ناردە قەزای هەڵەبجە. ئیتر بەیداغی کوردستانی، بە ئامادەبوونی بەگزادەی جاف و هەورامان و خەڵکی ناوەوە و دەرەوە، لێ هەڵکرا، نوتقی تێدا درا[٢٩١]. ئەو مەسەلەیە ساغ نەبوەوە و بکوژان سزا نەدران، بۆیە مونەووەرانی شار کەم وزۆر ترسیان لێ نیشت.

---

[٢٨٧] یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل٩٩–١٠٠.

[٢٨٨] هاوار، ب١، ل٤٧٩.

[٢٨٩] کرد وترك وعرب، ص٢٧٨.

[٢٩٠] یقظة الکرد، ص٢٦٠.

[٢٩١] بانگی کوردستان، ژ١٣، ل٦؛ ڕۆژی کوردستان، ژ٤، ل٣.

جەمال عیرفانی ئەفسەری عوسمانی و مونەووەری دیاری سەردەمەکە، شەوی چوارشەممەی ڕێکەوتی ١٢\١٣/١٢/١٩٢٢ بە قەستی کوشتکردن تەقەی لێ کراو بریندار بوو، دوای سێ سەعات کۆچی دوایی کرد[٢٩٢]. هەر ئەو مانگە، شێخ نووری شێخ ساڵح بە بایەخ پێدانێکی زۆرو پەرۆشییەکی لەڕادەبەدەرەوە ئاماژەی بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆکانی کۆنگرەی لۆزان کردووە لەسەر کێشەی ویلایەتی مووسڵ (کوردستانی جنووبی)، نووسیویە:

(( ئیستیرحام لە زیمامدارانی ئومووری ئیدارەمان ئەوەیەکە حوقووقی کوردستان فەرامۆش نەکرێ و لە لۆزان ئەم حەقە داوا بکرێ. چونکە: ئەمڕۆ ڕۆژێکە کە زۆر نازك و فرصەتە هەموو ئانێکی ئەم زەمانە ئەوەندە بەقیمەتە کە جەبری مافاتی قابیل نییە. ئەمڕۆ ڕۆژێکە کە موقەڕراتی هەموو میللەتێکی صاحێب حەق لەو مەجلیسەدا مەوضووعی بەحث ئەکرێ و هەموو قەومێ نائیلی ئامالی موقەددەسەی میللییەتی خۆی ئەبێ. ئەمڕۆ ڕۆژێکە کە ئەگەر بە غەفڵەت ڕایبوێرین موقابیلی هەموو ثانییەیەکی ئەبێ دە ساڵ عەذاب و ئەسارەت بکێشین. ئەمڕۆ ڕۆژێکە صبحەینێ هەرچەند بە ماضی ناوی ئەبەین بەڵام بۆ ئێمە ئیستیقبالێکی ڕووناکی تێدا تەئمین ئەکرێ. ئەمڕۆ ڕۆژێکە کە نابێتەوە ئەگەر لەم ڕۆژەدا فەرامۆش بکرێین ئەبەدییە عەذابێکی لایەتەناهییە. ئەمڕۆ ڕۆژێکە کە بۆ ئیستیردادی حەقێکی قەومییەت و میللییەت لە هەموو قەومێکی صاحێب ئیدراك یەکێك بۆ ئیثباتی حەقی مەشرووعەیان موطڵەقەن ئەچێتە ئەو مەجلیسەوە حەتتا چێویش بنێن بە ورگیانەوە هەر ئەچن. ئەمڕۆ ڕۆژێکە

---

[٢٩٢] ڕۆژی کوردستان، ژ٥، ٢٠ کانون اول ١٣٣٨، ل١.

حەق ئیثبات ئەکرێو ناحەق قبووڵ ناکرێ. کەوابێ حوقووقی خۆمان بۆ دەستی خۆمان ئەدرێ. مەسئەلەیەکی مەشهووری کوردییە تا ماڵ ڕاوەستابێ مزگەوت حەرامە، فانتبهوا !))[293]؛ لەکاتێکدا ئەو کۆنگرەیە ١٩٢٢/١١/٢٠ کرایەوە، لۆرد کیرزنو عیسمەت ئینۆنۆ بەشداری بوون. وەك تورکیا داوای ویلایەتی مووسڵی تا چیای حەمرین ئەکرد، ئینگلیزیش سنوورێکی لە هی ویلایەتەکانی باکوور زیاتری ئەویست[294].

ناوەندی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢، مەفرەزەی عەسکەرو پۆلیس نێردرایە چەمچەماڵ، بەیداخی کوردستان لە دائیرە حکوومیەکانی ئەو قەزایە هەڵکرا. ئیتر ئەو ناوچەیە لەوکاتەوە خرایە ناو قەڵەمڕەوی ئەو دووەم حکوومەتە[295].

ئەو ڕۆژانە، چەند لیژنەیەکی نهێنی بە سەرکردەیی‌ی سەید ئەحمەدی خانەقا لە کەرکووك پێك هێنرا بۆ پشتگیری‌ی تورك دژی ئینگلیز، ناوی (جەمعییەتی مودافەعەی حوقووقی کەرکووك- کرکوك حقوق مدافعەسی جمعیتی)یان لە خۆیان ناو پەیوەندییان بە ئووزدەمیرەوە هەبوو[296].

دووەم نیوەی کانوونی یەکەم، لە شێخانی تاڵەبانی شێخ فەیزوڵڵای شێخ قادرو شێخ عیززەددینو شێخ جەلالی شێخ حەمیدو شێخ وەهابو شێخ عەلیو شێخ تاڵیبو شێخ ڕەشید، لە سەرانی زەنگەنە غەفوور ئاغاو

---

[293] هەمان سەرچاوە، ژ٦، ٢٧ کانون اول ١٣٣٨، ل١-٢، ٣-٤.

[294] کرد وترك وعرب، ص٢٨٢.

[295] ڕۆژی کوردستان، ژ٥، ل٤.

[296] یادداشت، بەشی دووەم/ ب٦، ل٧٨.

جاسم ئاغاو ڕەشید ئاغاو قادر ئاغای سەفۆك ئاغاو لە سەرانی زەند غەنی ئاغا، هاتنە سەردانی شێخ مەحموود[297].

مەلیکی کوردستان ١٢/٣٠، پشت بەستوو بە تەلگرافی موڕەخەسی خۆی، ڕایگەیاند کاپتن چاپمان پیرۆزبایی‌ی لە سەربەخۆیی‌ی کوردستان کردووە. سمکۆ "سمایل خانی شکاك"یش کە بەهۆی پەلامارێکی هێزەکانی تورکەوە شکابوو، هاتبوە ئەمدیوو کانوونی یەکەم لە هەولێر بوو، ١٤ی ئەو مانگە ئەوو سەید تەهای نەهری نامەگۆڕکێیان بە برووسکە لەگەڵ شێخدا هەبوە بۆ بڕیاردان لەسەر دەرکردنی تورکەکان لە ڕەواندز. بەڵام شێخ ڕازی نەبوو، بەبێ جێبەجێبوونی بەڵێنەکانی بریتانیاو سەلماندنی مافەکانی کورد، هیچ بکات[298]. شێخ لە وەڵامدا بۆ سمکۆ گومانی لە بەڵێنەکانی ئینگلیز کردووەو نووسیویە:

((ئەمڕۆ حەقێکی ڕەسمی نەدراوە بە میللەتی کوردی ئێمە کە ببێتە سەبەبی جونبوش‌و مودافەعەی دوشمنانی خاریجی. وە هەرچەند ئێمە داوای لوطف‌و حوقووقمان کردبێ بە نەوع نەوع وەعدو بەهانە ئیمهال کراوە. ٣ مانگ لەمەوپێش حکوومەتی فەخیمەی بریتانیا ئەو موعاوەنەتە کە وەعدی فەرمووە لە صەد یەکێکی بەجێ نەهێناوە تاوەکوو منیش میللەتی کورد بە ئیستیقبالەوە طەماعداریان بکەم. بۆ حەقی شەڕو شۆڕم پێ خۆشە، بەڵام بۆ ناحەقی پێم خۆش نییە کە خوێنی موسڵمانانی کورد بڕێژم. ئەگەر لوطفەن حەقی خۆمان پێ ببەخشرێ حاضرین بۆ هەموو فیداکاری‌و دەفع‌و دوورخستنەوەی موعتەریضەکانمان. ئەگینا هەر بۆ

---

[297] ڕۆژی کوردستان، ژ٦، ٢٧ کانون اول ١٣٣٨، ل٤.

[298] هەمان سەرچاوە، ژ٧، ٣٠ کانون اول ١٣٣٨، ١، ٣-٤.

ئیطاعەتی موطـلەقەی حکوومەتی فەخیمە بە قەطعی قەول ئەدەم کە بێطەرەف و صادیق ئەمێنمەوە بەرامبەر دەوڵەتی موعەظەمەی بریتانیا ... هەموو میللەتی کورد بێتەرەددود حاضرە بۆ دەفعی دوشمنی خۆی بە شەرطێ وەکوو حکوومەتی بریتانیا بفەرموێ ... بێ زانینی سەبەب بێ چاوپێکەوتنی حەق موجادەلە بۆچی بکەین و بۆ مەنفەعەتی کێ خوێن برێژین))[299]. ئەمە ناوبانگی شێخی زیاد کرد، بەتایبەت لەلای شێخانی عەشایەری لیوا لەوپەڕی کفری یەوە تا تاڵەبانی[300]. نۆئێل و ئەدمۆندز، ئەو ماوەیە، لەسەر سیاسەتی پێڕەوکراوی ئینگلیز دەرهەق بە کورد ناکۆك بوون. نۆئێل لە چاوی سلێمانی یەوە ئەیڕوانییە مەسەلەکە؛ هەتا سەرسەختانەیش هەوڵی دا سەید تەهاو سمکۆو شێخ مەحموود یەك بخات تا کارێکی هاوبەش بکەن، بۆی سەرنەچوو[301].

نۆئێل هەتا لەلای شێخ بوو، هیچ بەرهەڵستییەکی نیشان نەدا، چونکە لە سیاسەتی مەندووبی سامی ناڕازی بوو؛ ئەیزانی چ داوێك بۆ چارەنووسی کوردستان نراوەتەوە، هاوسۆزی و خۆشەویستیی بۆ شێخ هەبوو. بە هەستێکی پەنهان دەرکی پێ کردبوو کە شێخ خاوەنی پەیامێکە بەو چاکەو خراپەو ڕاستو چەوتیانەوە کە هەیبوون. شێخ ناسیۆنالیستێکە نەتەوەپەروەریەکەی بێگەردە؛ یەکەم ڕابەرە کە ئەبێ دەوڵەتی داهاتووی کوردستان بەهۆی ئەوەوە بنیاد بنرێ" تەماعکارو

---

[299] هەمان سەرچاوە، ژ٧، ل١-٤.

[300] کرد وترك وعرب، ص٢٨٠.

[301] هەمان سەرچاوە، ل٢٧٤، ٢٧٩.

سەرسەختە، بە ڕادەیەك كە خۆپەرستانە پابەندی پرنسیپە ئەخلاقیەكان نابێ، بەڵام هەمیشە نەیارێكی شەرافەتمەندو بەڕێزە[٣٠٢].

وەزیفەی موفەتیشی عومومی، كۆتایی‌ی كانوونی یەكەمی ١٩٢٢ هەڵوەشێندرایەوە، چونكە سدیق پاشای قادری كە بە نووسراوی ژمارە (١٢٦٧٨)ی ١٩٢٢/٩/٢١ی مەندووبی سامی كرابوە موفەتیشی عموومی‌ی حكوومەتی كوردستان، بەقسەی خۆی، لەبەر جیاوازی‌ی بۆچوون و هەڵنەكردنی لەگەڵ شێخدا، ڕۆژی ١٩٢٢/١٢/٢٦ دەستی كێشایەوەو چووەوە بۆ بەغدا[٣٠٣]. عارف صائیب، لەپاڵ ئەحمەدی عەزیز ئەفەندی (خواجە)دا كە كاتبی مابەین بوو، كرایە كاتب ثانی (مابەین)ی دائیرەی تەحریراتی ملووكانە كە تایەری ئەمین ئەفەندی‌ی مەسرەف سەركاتبی بوو[٣٠٤].

هەردوو حكوومەتی بریتانیاو عیراق ١٩٢٢/١٢/٢١ دەقی ئەم بەیاننامەیەیان بۆ ڕازیكردنی كورد بڵاوكردەوە: ((حكوومەتی خاوەنشكۆی بریتانیاو حكوومەتی عیراق، دان بە مافی كوردی ناو سنووری عیراقدا ئەنێن كە حكوومەتێكی كوردی لەناو ئەم سنوورەدا دامەزرێنن. هەردوو حكومەت بەهیوان سەرانی كورد، بە جیاوازییانەوە،

---

[٣٠٢] یقظة الكرد، ص٢٥٤.

[٣٠٣] مذكرات القادري في بيان الثورة الروسية وايضاح غوامضها، نقله الى العربية القاسم العاوي، المطبعة العصرية- بغداد، ١٩٢٥، ص٢٤٨.

[٣٠٤] ڕۆژی كوردستان، ژ٧، ٣ كانون اول ١٣٣٨، ل٤..

زوو لەسەر شێوەی ئەو حکوومەتەو تا چ سنوورێك درێژ بێتەوە، پێك بێن، وەفدێکی دەسەڵاتپێدراو بنێرنە بەغدا بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ حکوومەتی خاوەنشکۆی بریتانیاو حکوومەتی عیراقدا سەبارەت بە پەیوەندیە ئابووری‌و سیاسیەکان))[٢٠٥].

شێخ وەفدێکی بە سەرۆکایەتیی سەید ئەحمەدی مەرەخەس‌و ئەندامێتیی مستەفا پاشاو حەمە ئاغای ئەورەحمان ئاغاو کەریم بەگی فەتاح بەگ‌و چەند کەسێکی تر، بۆ بەدەنگەوەچوونی ئەو بەیاننامەیە ناردە بەغدا. هێندەی هەوڵیان دا مەندووبی سامییان نەدی، چونکە ئەوانەی بە وەفدی شێخ دانابوو، نەك هەموو کورد[٢٠٦].

وادیارە تاقە چاپخانەکەی حکوومەت لەم دەورانەدا کاروباری چاپی بە گشتی پێ ڕایی نەکراوە، بۆیە دەفتەرێکی کۆمەك بە دەستپێشخەری‌و ڕێنیشاندەریی شێخ قادری حەفیدو هەوڵ‌و تەقەلای مولازم عەزیز حیکمەت قەزاز ڕێك خرا بۆ پیتاککردن بۆ کڕینی چاپخانەیەکی نوێ. سەرجەم (٢٣٢) کەس هاوبەشییان کرد، ٤٤٣٨ ڕووپیەی بۆ کۆکرایەوە[٢٠٧].

---

[٢٠٥] تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ص٢٧٤.

[٢٠٦] هاوار، ب١، ل٤٧١-٤٧٥.

[٢٠٧] ڕۆژی کوردستان، ژ٨و ٩و ١٠و ١١و ١٢و ١٣و ١٤ی ڕۆژانی ١٠و ١٧و ٢٤ی کانوونی دووەم‌و ٣و ١٠و ١٧و ٢٤ی شوباتی ١٣٣٨ (١٩٢٣)؛ لە بەڵگەنامەکانی حکوومەتی شێخ مەحموود: تۆمارێکی شارەوانیی سلێمانی، ل٤٠.

.سمکۆ، بە دۆستانی پشدەردا، هەواڵی نارد دێتە سلێمانی.
١٩٢٣/١/٧ شێخ قادر، لەگەڵ قوماندانی مەفرەزەی ژاندرمەو هێزێکی زۆرو گەلێ پیاوماقووڵدا، بەپیریەوە چوو. مستەفا پاشا رایسپارد ڕەفیق حیلمی گۆرانییەکی میللی ڕێك بخاتو بە قوتابییەکانی فێر بکات، تا لە بەرەوپیری سمکۆدا بخوێنرێتەوە، ئامادەی کرد[٣٠٨].
١/٨ دەوامی دائیرەکانی حکوومەت وەستێنرا، دووکان هەڵگیرا. ساداتو مەئموورانی عەسکەریو مولکیو سەرانو ئەشرافو مونەووەرانو ئەهالی، بۆ ڕێوڕەسمی پێشوازی، نزیکەی نیو سەعات بە سواریو پیادە ڕوویانکردە ڕێگەکە. ڕەئیسی داخلییەو کاپتن چاپمان بە ئوتومبیل، ڕەئیسەکانی تر بە سواری یا ئوتومبیل، تا سەعاتێکی ڕێگە بۆ پێشوازی چوون. سەرخێڵانو پیاوەکانیان هاتنە ناو ڕێوڕەسمەکە.
گەردوونەی حەزرەتی مەلیك سەعات ٦ کوردی (١ی دوانیوەڕۆ) لە شارەوە، نزیکەی نیو سەعات ڕێگە، هاتە پێشەوە بۆ پێشوازی، لە جێگەی تایبەتدا چاوەڕێیان کرد. هەموو هێزەکانی سوارەی میللیی ملووکانە، بە ڕیاسەتی قوماندانی قووای میللی، سەعاتەڕێیەك دوور تا کەناری شار لە هەردوولای ڕێگە ڕیزیان بەست. پاش قەدەرێ، سمکۆو ئەحمەد ئاغای برایو خزمانو پیاوەکانیو سەرانی عەشیرەتی پشدەر بابەکرئاغاو عەباس ئاغاو سەرۆکانی تری پشدەرو مەنگوڕو ئۆجاغ، لە خزمەت شێخ قادردا، تەواو نزیکی جێگەی حەزرەتی مەلیك بوونەوە. ئەوکاتە گەردوونەی حەزرەتیش تۆزێ چووە پێشەوە. تەوقەو بەخێرهێنان

---

[٣٠٨] یادداشت، ب٦، ل٤٩.

بـەجێهێنران. سمکـۆ لـە گەردوونـەی ملووکانـەدا جێکرایـەوە، هـەموان گەڕانەوە بۆ ناو شار.

بەیانی‌ی ئەو شەوە، بەقسەی شایەتحاڵێکی وەك ڕەفیق حیلمی، پێش هەتاوکـەوتن ئـەهالی‌ی شـاری سـلێمانی وردو درشـت، بـە پیـاوو ژنـەوە ڕژابوونە کۆڵانەکان. قوتابیان لەو کۆڵانەی ماڵی شێخ قادردا کە ئەچوو بۆ ماڵی شێخ مستەفای نەقیب کەوا بۆ سمکۆ ساز کرابوو، لەگەڵ پـۆلیس‌و عەسـکەردا بەرامبـەر بـە یـەکتر ڕیزیـان بەسـتبوو. خـەڵك تـا ئـەهات زۆر ئەبوون‌و لـەو دەشـت‌و کۆڵانـەدا جێیان نەئەبووەوە. تـەلارو پێش هـەیوان‌و بەرپەنجـەرەی خانوەکـان‌و سـەربانی مزگـەوتی گـەورەو دووکـان‌و بـازاڕ جمەیان ئەهات. دێهاتی نزیکی سلێمانی بەجارێ ڕوویان کردبوە ناوشـار. سمکۆ گەیشتەجێ[٢٠٩].

فەرمانـدەو ئەفـسەران‌و عەسـکەران سـڵاویان لـێ کـرد، گـەلێ گـۆرانی‌ی نیشتمانییان خوێندەوە. حەزرەتی مەلیك‌و سمکۆ، عەسکەرەکانیان یەکەیەکە پشکنی. دوایی تێکڕا هاتنەوە بۆ ناو شار. حەوت تۆپی سڵاوو ڕێز تـەقێنرا. شـاگردانی مەکتـەب گـەلێ گـۆرانی‌و شـیعری کـوردی‌ی نیـشتمانییان خوێنـدەوە[٢١٠]. مـستەفا پاشا وتـارێکی لـەبارەی سمکـۆوە پێـشکەش کـرد، داسـتانی خـەبات‌و پاڵـەوانیی بەدرێـژی تێـدا گێڕایـەوە[٢١١]. سوپاسـنامەی

---

[٢٠٩] یادداشت، ب٦، ل٥٠.

[٢١٠] ڕۆژی کوردستان، ژ٨، ل٤.

[٢١١] یادداشت، بەشی سێهەم، ل٥١.

سمکۆیش بۆ حکوومەت و خەڵك، لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٢٣/١/١٠ی "ڕۆژی کوردستان"دا بڵاوکرایەوە[٢١٢].

وەفدێکی شێخ لە محەمەد ئاغای ئەورەحمان ئاغاو تاهیری ئەمین ئەفەندی، ڕۆژی ١٩٢٢/١٢/٢٢، گەیشتە کەرکووك؛ داوای لە دەسەڵاتدارانی ئینگلیز کرد بەیاننامەیەك دەربکەن سەربەخۆیی‌ی کوردی لە سایەی حوکمی شێخ مەحمووددا تێدا بسەلمێنرێ[٢١٣].

ئەو ماوەیە تا ٣ی شوباتی ١٩٢٣، کەریم بەگی سەرۆکی جاف و محەمەد ئاغای ئەورەحمان ئاغاو سەید ئەحمەدی بەرزنجی و تاهیری ئەمین ئەفەندی، هەشت جار بۆ چارەسەری مەسەلەی سەربەخۆیی‌ی کوردستان، هاتوچۆی کەرکووك و بەغدایان کرد[٢١٤].

ئینگلیز ناڕازی نەبوو کە شێخ ڕانیەو کۆیە بخاتە ناو ئیدارەی خۆی، دوای ئەوەی تورکەکانیان لێ کشانەوە، تا شێخ بەلای خۆیدا ڕابکێشێ. هێزەکانی شێخ بە فەرماندەیی‌ی ڕەشید سدقی غەفووری ئەفسەر ١٩٢٣/١/١٤، دوای پێکهاتن لەگەڵ سەرانی جووڵانەوەی ڕەواندزدا، چوونە ناو قەزای ڕانیە، ئاڵای کوردستانیان تێدا هەڵکرد، داوایان لە تورکەکان کرد لە بێتواتە بکشێنەوە. ئەمجا چوونە ناو کۆیە، هاوکاری‌ی قایمقامیان کرد[٢١٥].

---

[٢١٢] ڕۆژی کوردستان، ژ٨، ل٣.

[٢١٣] د.ولید حمدي، الکرد وکردستان في الوثائق البریطانیة، ص١٥٩-١٦٠.

[٢١٤] عبدالقادر، قوم نجیب کورد، "ڕۆژی کوردستان"، ژ١١، ٣ شباط ١٣٣٨، ل١.

[٢١٥] الکرد وکردستان في الوثائق البریطانیة، ص١٦١؛ کرد وترك وعرب، ص٢٨٣؛ بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی، ل٥٤-٥٦.

سەید عەبدوڵڵای حاجی سەید حەسەن کرایە قایمقامی ڕانیە، لەکاتێکدا پێشتر وەکیلی موتەسەڕیفی سلێمانی بوو[٣١٦]. ڕۆژی ١٩٢٣/١/١٦، هێزی دۆبس و بۆردیللۆی سکرتێری مەندووبی سامی و ئەدمۆندزو بۆرتۆنی موقەددەمی هێزی ئاسمانی و ماکنیسی فەرماندەی ستوونی فڕۆکە لە بەغدا کۆبوونەوە، ڕێك کەوتن لەسەر:

١- مەندوبی سامی ١/٢١ برووسکەیەك بنێرێ بۆ شێخ مەحموودو داوای لێ بکات بێتە بەغدا.

٢- ئەگەر نەهات، هێزێکی فڕۆکە بچێتە سەر سلێمانی، بڵاوکراوە بەربداتەوە" تێیدا ڕابگەیەنێ کە شێخ لە حوکم لابراوەو مۆڵەتی پێنج ڕۆژی دراوەتێ بە هەموو ئەندامانی مەجلیسی لیواوە بگاتە بەغدا.

٣- دوو سریەی بەتالیۆنی ١٤هەمی سیخ بە شەمەندەفەر تا کەنگربان بێن، لەوێوە بە فڕۆکە ببرێنە کەرکووك. ئەم کردەوە عەسکەریە تازەیە، پێشتر لە دنیای تەکنیکی جەنگدا نەبوە، تا هێزەکانی لیڤی بەهێز بکرێن بۆ قایمکاری دژی هەر پەلامارێکی کتوپڕ.

٤- ئەگەر شێخ ڕازی نەبوو سلێمانی چۆڵ بکات، هێزی ئاسمانی سەربازگەکان و بارەگاکەی بۆردومان بکات[٣١٧].

مەندووبی سامی، لای حکوومەتی ئێران بۆ سمکۆ تێکەوت و لێبووردنی بۆ وەرگرت، تا هانی بدەن لە سلێمانی بڕوات. ئەدمۆندز

---

[٣١٦] بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی، ل٦٧؛ یادداشت، ب٦، ل٧٥.

[٣١٧] کرد وترك وعرب، ص٢٨٤.

بەرنامەیەکی دانا: ئەگەر نەتوانرا دەسەڵاتێکی ناوەندیی بەهێز لە سلێمانی دابمەزرێنرێ بۆ کۆنترۆڵکردنی لیواکە، چەند قەزایەك لە سلێمانی بکاتەوە" ڕانیە بخاتە سەر هەولێر، چەمچەماڵ و هەڵەبجەیش سەر کەرکووك. بڕیاریش درا چاپمان لە سلێمانییەوە بکێشرێتەوە، بەکردەوە شوباتی ١٩٢٣ هێنرایەوە بۆ کەرکووك[٢١٨].

وەفدێکی شێخ، کەریم بەگی جافو تاهیری ئەمین ئەفەندی، بە یاوەریی نوێنەری ئینگلیز لە سلێمانی، ١٩٢٣/١/١٩ گەیشتە کەرکووك، دوای ئەوەی چەند جارێك کۆبوونەوە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بریتانیادا دواخرا. شێخ بڕیاری دا لە قەزای چەمچەماڵ بمێنێتەوە، کە نزیکی کەرکووکە، تا کاتی پێویست بەشداریی دانوستان بکات. بنچینەی گفتوگۆی نێوان هەردوولا، ناوەڕۆکی بەیاننامەکەی هەردوو حکوومەتی بریتانیاو عیراق بوو، واتە مافی کورد بۆ پێکهێنانی حکوومەتێکی کوردی لە چوارچێوەی عیراقدا. حکوومەتی عیراق هێزی عەسکەریی نارده مووسڵ، هێزەکانی کوردیش گەیشتنە سەر سنوور، بۆیە گفتوگۆ کۆسپی هاتە ڕێ. ئەمە بارودۆخی کەرکووکی گرژ کرد[٢١٩].

وەزارەتی دارایی ی عیراق، بۆ تەنگەهەڵچنین بە شێخ مەحموود، بەیاننامەیەکی دەرکرد؛ داوای تێدا لێ کرد هەموو ڕسوومی سەر تێکڕای تووتنی سلێمانی نەدرێتە شێخ، چونکە ئەبوە هۆی ئەوەی کە بازرگانەکان مل بۆ داواکانی شێخ نەدەن و بودجەو داهاتەکەیشی کەم ببنەوە[٢٢٠].

---

[٢١٨] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[٢١٩] الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، ص١٦٢.

[٢٢٠] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

ئەدمۆندز، ڕۆژی ١٩٢٣/١/٢٠، ئەو چوار خاڵە ئاماژەبۆکراوەی بە برووسکە گەیاند بە شێخ. ١/٢٢ بیست فڕۆکە هێزی سیخیان هێنایە سەر کەرکووك، پاشان بەرەو سلێمانییان برد. بەڵام هەر دوانیان لە چەمچەماڵەوە گەیشتە سەر سلێمانی، بەیاننامەیان فڕێدایە خوارەوە. ڕۆژی ١/٢٣ شانزە فڕۆکە هەمان کاریان دووپات کردەوە، یەکیان لە دۆڵی بازیان دابەزیو یەکی کەوت. ئاغاکانی هەمەوەند پاراستیان، دوای چەند هەفتەیەك برایەوە[٣٢١].

ڕۆژی ١٩٢٣/٢/٤ لە گفتوگۆکانی کۆنگرەی (لۆزان)دا، بڕیاردرا کێشەی ویلایەتی مووسڵ وەلا بنرێو مۆڵەتی ساڵێك بدرێتە هەردوو حکوومەتی بریتانیاو تورکیا بۆ لێك تێگەیشتن. ئەگەر ئەوەیش سەری نەگرت، کێشەکە بخرێتە بەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکان؛ ئەم ماوەیە وەزعەکە وەك خۆی بهێڵرێتەوە، هەردوولا ڕێزی بگرن. بەم بڕیارە، پەیمانی سیڤەر بەتەواوی لەگۆڕ نراو حکوومەتی بریتانیاش ئەرکی یاریدەدانی کوردی عێراقی لەسەر نەما تا مافی خۆی بەکار بێنێ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کە ڕەنگبوو لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا دابمەزرێنرێ[٣٢٢].

شێخ سەرەتای شوباتی ساڵی ١٩٢٣ ئیرادەی دەرکرد بۆ هێنانی باندۆیەکی مۆزیقا بۆ عەسکەرییە[٣٢٣]؛ بە نامە داوای لە مەلیك فەیسەڵیش کرد، قسە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بکاتو بکەوێتە نێوانیان. مەلیك ڕازی نەبوو، لە وەڵامیدا بە پێویستی دانا هەمان دەنگدان بۆ

---

[٣٢١] کرد وترك وعرب، ص٢٨٥.

[٣٢٢] هەمان سەرچاوە، ل٢٨٢.

[٣٢٣] ڕۆژی کوردستان، ژ١١، ل٤.

دەستنیشانکردنی بە مەلیك لە کوردستانیش بکری[٣٢٤]. هاوکات شێخ کەوتە ڕاپەڕاندنی کاروباری ناوچەکانی لیوای کەرکووك[٣٢٥].

ڕۆژی ١٩٢٣/٢/٧ یووزباشی فەتاح بەگی ئەمین عەتاری ژنبرای شێخ لە ئەنقەرەوە گەیشتە سلێمانی، گفتی یارمەتیی هێنا[٣٢٦]. شێخ لە ئینگلیز نائومێد بوو، زیاتر پەیوەندیی بە ڕەواندزەوە بەست، داوای لە ئووزدەمیر کرد وەفدێکی خۆی بنێرێتە سلێمانی. تورکخواکانو تاهیری ئەمین مەسرەفی سەرکاتبی (مابەین)ی دائیرەی تەحریراتی ملووکانەو فەتاح بەگی ژنبرای، دەورێکی کاریگەریان لە نزیکخستنەوەی شێخدا لە تورك هەبوو[٣٢٧].

نوێنەرەکانی ئووزدەمیر بەردەوام نامەیان بۆ شێخ ئەهێنا، ئەویش بە سەید محەمەدی موفتیو عەبدوڵڵای حاجی حەمەسەعیدو مەجید بەگی حاجی ڕەسووڵ بەگدا وەڵامی بۆ ئەناردەوە. ئووزدەمیر ١٠ مەرجی داناو بە وەفدێکی سێ کەسی ی خۆیدا، ئەحمەد تەقیو فەوزی بەگو ڕەمزی بەگ، ناردی بۆ شێخ، هەتا لەگەڵ سەرخێڵانو گەورەکانی کورددا لێی بکۆڵنەوە" بڕیاری لێ بدەنو بەناوی کوردەوە ئیمزای بکەنو دوو وێنەی بە بڕواپێکراوی خۆیاندا لێ بنێرنەوە بۆ ڕەواندز: یەکیان لەلای ئووزدەمیر بمێنێتەوە، ئەوی تر بەو بڕواپێکراوانەو نوێنەری ئووزدەمیردا بنێردرێتە

---

[٣٢٤] الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، ص١٦٠-١٦١.

[٣٢٥] كرد وترك وعرب، ص٢٨٣.

[٣٢٦] هەمان سەرچاوە،، ل٢٨٢؛ ڕۆژی کوردستان، ژ١٢، ل٤.

[٣٢٧] بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی، ل٦٩؛ یادداشت، بەشی دووەم /ب٦، ل٣٩، ٥٦.

ئەنقەرە، مەجلیسی گەورەی میللەتو حکوومەتی تورك دواین بڕیاری بۆ دەربکەن[٣٢٨].

شێخ، ڕۆژی ١٩٢٣/٢/١٧ نامەیەکی بۆ نوێنەری بریتانیا نارد کە لە سلێمانی کێشرابوەوە، دژی هەڵوێستی سلێمانیو نوێنەرانی لە گفتوگۆکانی کەرکووکدا لەسەر مەسەلەی کورد؛ داوای لێکرد بگەڕێتەوەو داخی بۆ بێئاکامیی ئەو گفتوگۆیانە دەربڕی. ئاماژەیشی پێکرد کە ئامادەیە وەفدێکی نوێنەری خۆی، لە هەرکاتێکدا بێ، بنێرێ. وەڵامی مەندووبی سامی ئەوە بوو کە شێخ بانگ بکرێتە بەغدا، بۆ بینینی خۆیو قسەکردن لەسەر هەندێ کێشەی تایبەت بە سلێمانی، بەڵێنیشی دایێ بەوپەڕی ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکات. ئاگاداری کردەوە کە ئەگەر ئەوە نەکات، ڕێوشوێنی پێویستی بەرامبەر دائەنرێ. شێخ وەڵامی دایەوە کە هیچ هۆیەك شك نابات بۆ هاتنە بەغدا، نوێنەرەکانی ئەتوانن هەموو مەسەلە هەڵپەسێردراوەکان چارەسەر بکەن[٣٢٩].

کاپتن لاینو شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەمو بابەکر ئاغا، دەسەڵاتدارانی ئینگلیزیان ئاگادار کردەوە کە شێخ مەحموود نەخشەی داڕشتووەو لەگەڵ هەندێ لایەنگری وەك مەحموودخانی دزڵیو عەباسی مەحموود ئاغادا سوێندیان بە قورئان خواردووە کە پەلاماری کەرکووكو هەولێر بدەن. قایمقامی خانەقینیش بە لیوای کەرکووکی ڕاگەیاند کە خێڵە کوردەکانی کفری خۆساز ئەدەن هێرش بەرنە سەر کەرکووك[٣٣٠].

---

[٣٢٨] یادداشت، ب٦، ل٩٢، ٩٣.

[٣٢٩] الکرد وکردستان في الوثائق البریطانیة، ص١٦٣-١٦٤.

[٣٣٠] هەمان سەرچاوە، ل١٦٤؛ کرد وترك وعرب، ص٢٨٣.

ئەو ماوەیە سەید تەهای ئەمری چووە بەغدا، بەپێی نامەیەکی سەید عەبدوڵلای حاجی سەید حەسەن بۆ ئووزدەمیر، دەنگ بڵاو بوو کە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا ڕێك کەوتووە، جگە لە جبەخانەیەکی زۆر، ملیۆنێك ڕووپیەی لێ وەرگرتوون بۆ دەرکردنی تورکەکان لە ڕەواندز[231].

دوا ڕۆژەکانی ئەو زستانە (سەرەتای ۱۹۲۳)، سلێمانی پڕبوو لە سوارەی عەشایەر. لە کۆڵانەکان و ناوبازاڕدا لەبەر هاتوچۆکەری چەکدار ڕێ بەر نەئەکەوت. دیوانی شێخ مەحموود گەورەکانی کوردو سەرۆك عەشیرەتەکانی تێدا کۆبووبوونەوە. نامەگۆڕکێیەکی بەردەوام لەنێوان سلێمانی و ڕەواندزدا هەبوو. گرنگترینی ئەو نامانە، ئەو مەزبەتەیە بوو کە بۆ سەرگرتنی پێکەوەژیانی کوردو تورك شەوەها بە نووسینیەوە ڕۆژ کرابوەوەو بڕیری لێ درابوو و ئیمزاکرابوو و نێردرابوە لای ئووزدەمیر، فەوزی و ڕەمزی و ئەحمەد تەقیش مەرجەکانی تورکیان لە وەڵامیدا هێنابوەوە[232].

دوا جار کۆنگرەی سەرخێڵان و گەورەپیاوانی کورد بڕیاری لەسەر نووسینی مەزبەتەدا، شێخی تێدا بە (ڕەئیسی هەیئەتی تەمثیلییەی کوردستانی جنووبی) ناسێنرا، ۲٦ کەس ئیمزایان کرد: سمکۆو بابەکری سەلیم ئاغاو عەباسی مەحموود ئاغاو ساڵح ئاغای پشدەرو ئاغای بایزی ئۆجاغ و حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغاو جەعفەر سوڵتانی هەورامان و ئەمینی مەحموود ئاغای هەمەوەندو محەمەد تالیبی سمایل عوزێری و ڕەزا بەگی سمایل بەگ و حامید بەگی مەجید بەگی جاف و عەزیزی سەرۆکی داودەو عەلی حەسەن ئاغای زەنگەنەو محەمەد ئاغای زەنگەنەو ڕۆستەمی سەرۆکی

---

[231] یادداشت، ب٦، ل٨٩.

[232] هەمان سەرچاوە، ب٦، ۹۳-۹٤.

ڕۆغزاییو محەمەدی سەرۆکی شاتریو محەمەد حەسەنی سەرۆکی تەرخانیو ڕەفعەتی سمایل ئاغای سەرۆکی داودەو فارس ئاغای بەیاتو سمایل بەگی بەیاتو سادق ئاغای سەرۆکی زەندو ڕۆستەم ئاغای ئەورەحمان ئاغای پالانیو ڕەشید ئاغای پالانیو سەید خەلیل ئاغای سەرۆکی کاکەییو (....) محەمەدساڵح ئاغا. ڕۆژی ١٩٢٣/٢/٢١، ڕەفیق حیلمیو ئەحمەد تەقیو فەتاحی ئەمین عەتار پێش هەتاوکەوتن لە ماڵی وسوو ئاغاوە، لەگەڵ چوارکەسی تردا، ڕێی ڕەواندزیان گرتەبەر[٣٢٣].

شێخ ئەو ڕۆژانە، بۆ پەیداکردنی دۆستو هاوکار، نامەو پەیوەندیی بە شێخ مەهدی خاڵیسیی پێشەوای دینیی شیعەوە لە بەغدا هەبوو، تا هاوئاهەنگیی لەتەکدا بکات بۆ گوشار خستنە سەر حکوومەتی بریتانیاو عیراق بۆ بەدیهاتنی داواکانیان. زانایانی دینیی نەجەفو کەربەلایشی تێگەیاند بۆ بەدەستهێنانی یارمەتییان[٣٢٤].

شێخ کەوتبوە نێوان دوو بەرداشەوە؛ لەلایەکەوە مەندووبی سامیو مەلیك فەیسەڵ بەڵێنی دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردییان دابووێ، کەچی هیچیان دیار نەبوو؛ لەلایەکی ترەوە نەیئەتوانی بە ناوێکەوە کورد یەك بخاتو هێزێکیان بەرامبەر بە تورك لێ پێك بهێنێ، چونکە هیچ بەڵگەو پشتیوانو هیوایەك نەبوو بۆ ئەو بەگژداچوونە. شێخ، وای بۆ ئەچوو ئەگەر ئەوسا تورك ویلایەتی مووسڵی بە زەبری هێز وەرگرتەوە، کێ

---

[٣٢٣] هەمان سەرچاوە، ب٦، ل١٠٦-١٠٧؛ سدیق ساڵح، سێیەم بەشی یادداشتو چەند ڕاستکردنەوەیەك، "کوردستانی نوێ" (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ١٣٩١، ١٩٩٧/٢/٣.

[٣٢٤] الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، ص١٦٣؛ يقظة الكرد، ص٢٦٦.

ئەكەوێتە فریای ؟ ئینگلیز کە ئەوکاتە هیچی بۆ نەکات، پاشان چیی لێ ئەوەشێتەوە[٢٢٥].

ڕۆژانی ٢٤و ١٩٢٣/٢/٢٥، بەیاننامە بۆ شێخ مەحموود بەردرایەوە کە ئەگەر خۆی‌و ئەندامانی مەجلیسی لیوا لە ماوەی پێنج ڕۆژدا نەگەنە کەرکووك تا بچنە بەغدا، سلێمانی بۆردومان ئەکرێ؛ پێی ڕاگەیەندرا کە لە حوکمی شار لابراوە، داوایش لە سمکۆ کرا تا زووە شار بەجێ بهێڵی[٢٢٦].
ئیتر شێخ فەرمانی بە وەفدەکەی دا لە ڕەواندز کە بەرەو ئەنقەرە بکەونە ڕێ. نووزدەمیریش، فەوزی بەگ‌و ڕەمزی بەگی خستە پاڵیان. ئەوانە بە (زینۆی شێخ)دا چوونە دیوی ئێران[٢٢٧].

شێخ کە تەسلیم نەبوو، فەرمان‌و ئاگادارییەکی توندوتیژی بە نامەیەکی درێژ بۆ نێردرا. نامەیش بۆ شێخ عەبدولقادری سەنگاوو بابەکر ئاغاو عەباس ئاغاو بەگزادانی جاف‌و عەبدوڵڵاخان بەهادورو محەمەد ئەمین ئاغای هەمەوەندو سوار ئاغای بڵباس نووسرا، ئاگادار کرانەوە کە حکوومەتەکەی شێخ مەحموود هەڵوەشاوەتەوەو ڕێنوێنیی تازەیان درایە: شێخ عەبدولقادر بەرپرسی ناحیەکانی قەرەداغ‌و سەنگاو، ئاغاکانی پشدەر هی قەزاکانی قەڵادزێ‌و پشدەرو مەرگە وەربگرن، لە ڕێی جەمیل ئاغای قایمقامی کۆیەوە پەیوەندی بە ڕاوێژکاری ئینگلیزەوە بکەن لە کەرکووك. بە بەگزادانی جاف وترا: هەڵەبجە لە ئیدارەی لیوای

---

[٢٢٥] یادداشت، بەشی سێیەم، ل٦٠، ٦١.

[٢٢٦] کرد وترك وعرب، ص٢٨٤.

[٢٢٧] یادداشت، بەشی سێیەم، ل٧٢.

سلێمانی جیا بکەنەوەو پەیوەندییان بە ئەفسەری سیاسی‌ی کفری‌یەوە هەبێ؛ قایمقامی چەمچەماڵ کاروباری خۆی بەڕێوەبەرێ؛ بە "سوار ئاغای بڵباس" ڕاگەیەنرا کە ڕانیە لە حکوومەتی سلێمانی دابڕێ، بە سەید عەبدوڵڵاش وترا بچێتەوە بۆ سلێمانی، قایمقامیەتی ڕانیە بداتە کۆنترین ئەفسەری هێزی لیڤی[٣٣٨].

سمکۆ ڕۆژی ١٩٢٣/٢/٢٨ سلێمانیی بەجێهێشت[٣٣٩]. ٣/١ بە دوا مۆڵەت دانرا بۆ شێخ، تا شار چۆڵ بکات. بەڵام نەیکرد[٣٤٠]. شێخ ڕایگەیاند، ئامادەیە وەفدێکی تر بنێرێ بۆ دانوستان لەگەڵ نوێنەرانی ئینگلیزدا؛ ئەگەر سەری نەگرت، لە سلێمانی ئەکشێتەوە تا خەڵك ماڵ وێران نەبن[٣٤١].

دەسەڵاتدارانی ئینگلیز جانتای پۆستەی نێوان ڕەواندزو ناوچەی جزیری کوردستانی باکووریان کەوتە دەست کە نامەگۆڕکێ‌ی نێوان شێخ و ئووزدەمیر بوو؛ شێخ لایەنگریی تورکی تێدا نواندبوو، پێشنیاری کردبوو هێرشێکی زووبەزوو بکرێتە سەر کەرکووك و کفری و کۆیە، بە هاوکاری‌ی سەید ئەحمەدی خانەقا لە کەرکووك و نازم بەگی نەفتچی

---

[٣٣٨] الکرد وکردستان، ص١٦٦.

[٣٣٩] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص٣٠٥. لە ژمارە ٦٤٨ی ڕۆژی ١٩٢٣/٤/١٢ی ڕۆژنامەی "الموصل" وەرگیراوە.

[٣٤٠] هەمان سەرچاوە، ل٣٠٦. لە ژمارە ٩٩ی ڕۆژی ١٩٢٣/٧/١٩ی ڕۆژنامەی "العالم العربي"یەوە وەرگیراوە.

[٣٤١] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

زادەی مەبعووسی پێشووی کەرکووك لە پەرلەمانی عوسمانیدا. ئینگلیز، لە سەرچاوەی ترەوە، زانیی سەید ئەحمەد چەکیشی کڕیوە[٢٤٢].

ڕۆژی ١٩٢٣/٣/٢ ئاووهەوا ناساز بوو. فڕکەکانی ئینگلیز کە ڕەوانەی سەر سلێمانی کرابوون، گەڕانەوە. ڕۆژی دوایی (٣/٣) چەند بۆمبایەکیان بە وردی بەردایەوە. هەمان ڕۆژ، وەفدێکی شێخ گەیشتە کەرکووك، هیچی بۆ نەکرا. شێخیش، سەعات ٢,٥ی بەیانیی (٣/٤) بە زۆربەی هێزەکانیەوە شاری بەرەو سووورداش چۆڵ کرد[٢٤٣].

دوا ژمارەی "ڕۆژی کوردستان" سەبارەت بە داوای (تەخلییەی سلێمانی) نووسیویە: (( لەپاش مواصەڵەتی حەضرەتی مەلیك وەضعییەتی مەملەکەت خرایە شکڵێکی حکوومەتییەوە ئەم شکڵە فەوقەل مەئمووله لە سایەی هیممەتی خوداپەسندانەی حەضرەتی مەلیکەوە ئەمە پێنج شەش مانگە دەوام ئەکا و لە ظەرفی ئەم موددەتەدا بۆ تەرویجی ئامالی حکوومەتی ئینگلیزو تەشکیلی حکوومەتێکی کوردییە لێرەوە موتەعەددید هەیئەت، مورەخەص بۆ کەرکووك و بۆ بەغداد بۆ موذاکەرە ڕۆیشتوون و هاتوون و ئەم موحیطە دائیما بۆ ڕۆژێکی وا یەعنی بۆ تەشکیلی حکوومەتێکی کوردییە چاوەڕوانی لوطفی حکوومەتی ئینگلیز بوون و موتەمادییەن سەعیی بۆ ئیدامەی دۆستایەتی ی حکوومەتی ئینگلیزی کردووە کەچی مەعەل تەئەسوف موقابیل بەم دۆستایەتیە حکوومەتی ئینگلیز ئەم میللەتە مەظڵوومە بە بۆمباردومان تەهدیدو

---

[٢٤٢] هەمان سەرچاوە، ل١٦٨.

[٢٤٣] کرد وترك وعرب، ص٢٨٥.

تەخویف ئەکا. تێناگەین مەعنای چییەو لەبەر چییە عەجەبا حکوومەتی فەخیمە لە طەرەفی کوردێکەوە تەهدید کرا کە ئێرەی تەخلییە کرد یاخۆ موقابیل بە خۆی هیچ قووەتێ لە کوردستانا شك ئەبا کە مودافەعەیەك بکا. ئەگەر غەیری حورییەت و ئازادیی میللییەی خۆمان دەعوایەکی ناحەقمان لێ واقیع بووە باشە وەئیللا ژن، منداڵ، فەقیرو خانووی ئەم میللەتە گوناهی چییە کە بۆمباردومان ئەکرێ. یاخود حکوومەتی فەخیمەی ئینگلیز لە خوێن ڕشتنی ئەم میللەتە چە ئیستیفادەیەك ئەکا، تێناگەین))[٣٤٤].

وەفدەکەی شێخیش کە پێشتر لە ڕەواندزەوە جووڵابوو، بەڕێی قۆقازو (دەریای ڕەش)دا چووە ئەستەمووڵ و پاشان ئەنقەرە، ١٩٢٣/٤/٢٨ حسێن ڕەئووف بەگی سەرۆک‌وەزیرو ١/٥ یش غازی "مستەفا کەمال"یان بینی، هیچیان دەست نەکەوت. "ڕەفیق حیلمی"ی ئەندامێکی ئەو وەفدە، لە دووەم نیوەی ئەوساڵەدا گەڕایەوە بۆ کوردستانی جنووبی[٣٤٥].

### ٢. ٣. سێیەم حکوومەتی کوردستان (تەمووزی ١٩٢٣-١٩٢٤/٧/١٩):

#### ٢. ٣. ١. دووەم خولی حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز لە سلێمانی:

دوا جار شێخ بەناچاری چووە ناوچەی سورداش. بەڵام شێخ حەمەغەریب لەگەڵ ڕەزا بەگو ئەوڕەحمان ئاغای ئەحمەد پاشادا، بە

---

[٣٤٤] ڕۆژی کوردستان، ژ١٥، ل٣-٤.

[٣٤٥] بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: (ل٧٣) بەدواوە تا کۆتایی:یادداشت، بەشی سێهەم.

پاڵپشتی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، مایەوە، ماوەیەکی تر بەناوی شێخەوە حوکمی سلێمانیی کرد[٣٤٦]. ئەحمەد موختار جافیش بە گیراوی برایە دەرەوەی شار، ئەگەرچی پێشتر بۆ هوودە بە شیعرێکی بڵاوکراوە بە ((عەرضی خولووص و بەندەگی و دوعاخوانیی بە صەبادا بردبوو بۆ خدمەتی شاهی موحیطی گشت سلێمانی)) و داوای لێ خۆشبوونی لێ کردبوو[٣٤٧].

شێخ بۆ چۆڵکردنی شار، ئەم شیعرەی وتووە:

تخم زحمت در ره دین در دل و جان کاشـــتیم

در فلك نوك عـلم در يـك زمان افراشــــتيم

چون به عزم این ســفر پا از میان برداشتیم

دست از جاه و جلال و خان ومان برداشـتیم

بارها بر لشــــكر بدخـــواه كفار تاخـــتیم

جای اســـتحکام ایشان منزل خود ساختیم

در ره دین‌پروری هم مال و هم جان باخـــتیم

تا ز کردســـتان غبار کفر از آن برداشـــتیم[٣٤٨]

ئەو وەفدەی شێخ کە ڕۆژی ١٩٢٣/٣/٣، بە سەرۆکایەتی‌ی شێخ قادری برای و ئەندامێتی‌ی مستەفا پاشا یامولکی و ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ و

---

[٣٤٦] الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، ص١٧٠.

[٣٤٧] ڕۆژی کوردستان، ژ١٤، ل٢-٣.

[٣٤٨] هاوار، ب١، ل٥٠٧.

کـەریمی عەلەکـەو حەمـەئاغای ئـەوڕەحمان ئاغـا چووبوە کـەرکووك، بـۆ گفتوگـۆو ڕێککـەوتن لەگـەڵ ئینگلیـزدا، ٣/٢١ گەیـشتە بەغـدا؛ شـێخ عەبدولکـەریمی قادرکـەرەمیش هاتـە پاڵیـان. "هێنـری دۆبـس"یـان دی. ئەگەرچی جەختیان لەسەر ناردنەوەی ڕاوێژکارەکەی ئینگلیز کردەوە بۆ سلێمانی، هیچ شتێك لەبارەی پاشەڕۆژەوە گەڵاڵە نەکرا. ڕۆژی ٣/٢٣یـش، چاویان بە مەلیك فەیسەل کەوت"[٣٤٩].

هـەردوو ستوونی (کـۆی کـوول)و (فرۆنتیـەر کـوول) لـە ٣/٨ بـەدواوە، یەکەم لە مووسڵەوە بۆ هەولێرو پاشان کەرکووك، دووەم لـە هـەولێرەوە بۆ ڕەوانـدن، سـازکران. (کۆیـە) ڕۆژی ١٩٢٣/٤/٥ گیرایـەوە. هێزەکـانی جووڵانـەوەی ڕەوانـدز شـەوی ١٩\٢٠/٤ (سـپیلك)یـان بەجێهێـشت، ڕەواندزیش ٤/٢٢ بەبێ بەرەنگاری داگیر کرایەوە، سەید تەهای نـەهریی لێ کرایە قایمقام"[٣٥٠].

هێزەکانی شـێخ لـە ناوەڕاستی مـارتی ١٩٢٣دا هـەوڵیان دا سـلێمانی داگـیر بکەنـەوە، بـەڵام بۆردومـانی بـەردەوامی فڕۆکـەکانی ئینگلیـز نـەیهێشت[٣٥١]. هێنـری دۆبـسی مەنـدووبی سـامی لـە ٣/٣٢دا سـەری لـە کـەرکووك دا، تـا ئـارامی و ئاسـایش بـۆ ناوچـەکانی لیـوا بگێڕدرێنـەوەو تێکدەرانیش تەمێ بکات. لەگەڵ ئەدمۆندز سەری لە هەولێریش دا؛ لـەوێ لەگـەڵ مـیر زەیـددا کۆبـووەوە، کـە سـەرەتای مـارت نێردرابـوە مووسڵ تـا

---

[٣٤٩] هەمان سەرچاوە، ل١٦٩.

[٣٥٠] كرد وترك وعرب، ص٢٨٧، ٢٨٨-٢٨٩، ٢٩٢.

[٣٥١] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص٣٠٨.

هێــزی خۆبەخــشانی نــانیزامیو بــەرگری عــەرەبی پێــك بهێنــن بــۆ بەرەنگاریی هەر هەڕەشەیەکی کەمالیەکان[٣٥٢].

بارەگاکەی شێخ سەرەتا لە قەمچووغە دانرا، دوایی برایە ئەشکەوتی جاسـەنە[٣٥٣]. دوو ژمارەو پاشـکۆیەکی ڕۆژنامـەی "بـانگی حـەق"، ٢٨ی مارتو ١٢ی نیسانی ١٩٢٣، بە چاپخانەکەی سلێمانی کە گوێزرابوەوە بۆ ئەوێ، لەچاپ دران. کاربەدەستانی ئینگلیـز بـەوردی چاودێریی سەرانی تورکخوازەکانیان ئەکرد. سەید ئەحمەدی خانـەقا ١٩٢٣/٣/٦ دەستگیر کرا، دوور خرایەوە بۆ بەغدا. نازم بەگی نەفتچی زادەی مەبعووسی پێشووی لیوای کەرکووك، فریای خۆی کەوت، لە کەرکووك هەڵات[٣٥٤]و بە مەزبەتـەوە هاتـە جاسـەنە لای شـێخ. "ڕەشـید شـەوقی"ی ئەفـسەرێکی شـۆڕش، بـە ڕاسپێریی شێخ نێردرایە لای شێخ عەبدوڵڵای عەسکەرو بۆی نووسـرا بـە سوارەو پیادە یاریدەیان بدات بۆ پەلاماردانی کەرکووك، نەیکرد[٣٥٥].

ئەو ماوەیە، شێخ بـە نـاوی "باشقوماندانو مـەلیکی کوردستان"ـەوە چـەند بەیاننامەیـەکی بـڵاو کـردەوە، یەکـەم لـە ١٩٢٣/٣/٨داو دووەم لـە ژمارە (١)ی "بـانگی حـەق"دا. (هەیئـەتی مودافەعـەی میللییـە)یـشی پێك هێنا، وا کە مەجلیسێکی وەکالەتی هەبێ، قیدەملی یووزباشی (موقەددەم) سـەید عەبـدوڕڕەزاق ئەفەنـدیی قومانـدانی مـەفرەزەی هەشـتەم سـەرۆكو

---

[٣٥٢] هەمان سەرچاوە، ل٣١٠-٣١١.

[٣٥٣] هەڵۆ، ڕوون کردنەوەیەك دەربارەی هەندێك لە باسەکانی چیم دی.

[٣٥٤] الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، ص١٦٨.

[٣٥٥] بەسەرهاتووی کاکە ڕەشیدشەوقی، ل٥٤.

مستەفا ئەفەندی حاجی حەمەسەعید ئەفەندیی قۆمیسەرو ئیبراهیم ئەفەندیی وەکیلی زابت ئەنداماںو شوکری ئەفەندیی کوڕی کەریم عەلەکە کاتبی بێ. ئەم هەیئەتە، بەپێی تەعلیمنامەکەی، بۆ کۆکردنەوەی هەر جۆرە یارمەتیو پیتاکێك بووە بۆ ئۆردووی کوردستان: وەك پارە، ئەسپ، ئێستر، ئەسلەحە، جبەخانە، جامانە، کلاو، کراس، دەرپێ، قوماشی جل، چاکەت، پانتۆڵ، دوولاق، گۆرەوی، گوش، سوخمە، بەتانیە، کلیم، مسقالی، چیت، دەستەسڕ، دەرزی، دەزوو، شەکر، چای، کاوڕ، بەرخ، ڕۆن، ساوەر، نۆك، ئارد، جۆ، پاچ، بێڵ، خاکەناز ... هتد[٢٥٦].

نووزدەمیری فەرماندەی هێزی تورك لە ڕەواندز، گەیشتە ئەشکەوتی جاسەنە، شێخی بینی؛ هانی دا بچێتە سەر هەولێرو کۆیەو کەرکووكو کفریو خانەقین، داگیریان بکات. دواتر گەڕایەوە، عەباسی مەحموود ئاغای پشدەرو غەفوور خان، بە نووسراوی شێخ، ئاگادارکرانەوە یارمەتیی بدەن بۆ کشانەوەو بە (کانیەڕەش)دا چوونە دیوی ئێران تا بگاتەوە بە تورکیا[٢٥٧].

١٠ ئەفسەری لەشکری کورد: عیززەتی تۆپچیو ئەمین ڕەواندزیو عەلیو عەزیز کوردیو ڕەشید شەوقیو عەزیز حیکمەت قەزازو مەجید توراشو نووری بەگو فایەق کاکەمینو خالید سەعید، یەکیان گرت"

---

[٢٥٦] بڕوانە: عەلاوەی ژمارە ١ی "بانگی حەق"، ژ٣، ١٢ نیسان ١٣٣٩، ل٢.
جێی وتنە، لە عەلاوەی ژمارە ١دا، محەمەد بەگی حەسەن بەگی کاتبی خەستەخانەی سلێمانی بە کاتبی هەیئەتەکە ناوی هاتووە.

[٢٥٧] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە؛ چیم دی، ب٢، ل١٧-١٩.

هـەولّیان دا شـێخ لـە تـورك بتەكێننـەوە، كارەكـەیان سـەری نـەگرت. توركخواكانی دەوری شێخ، بۆیان تێچاندن. ئەنجام، وازیان لێ هێنرا[٢٥٨].

شێخ کـە هاتـە سـووورداش، سـەری لـە پـشدەر دا بـۆ بەدەسـتهێنانی كۆمـەك و لایـەنگری بـۆ لێـدانی ئینگلیزەكـان و پـەلاماردانی پاشـكۆی هێزەكانیـان، شـتێكی ئـەوتۆی دەسـتگیر نـەبوو. هـەر مـارتی ١٩٢٣یـش، بابـەكر ئاغـای پـشدەریی بەنامەیەكـەوە ناردە لای بەرپرسـانی ئینگلیـز، داوای لێكـردن مـەرجی خۆیـانی بـۆ بەرقـەراركردنی ئاشـتی بـۆ ڕوون بكەنـەوە. بـەڵام ئـەوان پێداگرییـان لەسـەر چـوونە بەغـدای كـردەوە[٢٥٩]. هـەمان مـانگ، ڕۆژی ٣/٢٥ میر زەیـدی بـرای مـەلیك فەیـسەڵ سـەری لـە هەولێرو كەركووك دا. ناوچەكانی دەوری كەركووك بە گـەرمی و لـە هـەولێر زیاتر پشتیوانیی سەربەخۆییی تەواوی كوردیان كرد[٢٦٠].

جگـە لـەو چـەندین ئەفسەرو پێـشمەرگەیە كـە لـەناو هێزەكـەی شـێخ مەحمووددا بوون، محەمەد وەفای قەڵادزەیی و نووری عـەلی، دوو دكتـۆری شـۆڕش بـوون، لەگـەڵ هێزەكـەی شـێخدا هاتبوونـە دەرەوە[٢٦١]. هـەر ئـەو

---

[٢٥٨] بەسەرهاتووی كاكە ڕەشید شەوقی، ل٥٤.

[٢٥٩] كـرد وتـرك وعـرب، ص٢٩٦؛ عبـدالرحمن إدريـس صـالح البيـاتي، المـصدر نفسه، ص٣١٢ (لە ژمارە ٦٤٣ی ڕۆژی ١٩٢٣/٣/٣٠ی ڕۆژنامـەی"الموصل"ـەوە وەرگیراوە).

[٢٦٠] الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، ص١٧٠.

[٢٦١] چیم دی، ب٢، ل٢٩؛ هـەڵۆ، چەند ڕوونكردنەوەیەك سەبارەت بە هەندێ لـە باسەكانی چیم دی؛ عبدالرقيب يوسف، لە كەلەپووری بەڵگەنامـەیی كوردی/ ٢، "ڕۆشنبیری نوێ"، ژ١١٢، ١٩٨٦، ل٢٩٢.

سەروبەندە، ئەحمەد موختار جاف کە بە بەندکراوی برابوە دەرەوەی شار، بەردرا.

فڕۆکەکانی ئینگلیز ٣/٢٨ بەیاننامەیەکیان بەسەر شاری سلێمانیدا بەردایەوە، سەبارەت بەوەی کە حکوومەت شار ئەگرێو نابێ هیچ بەرگرییەك بکرێ[٣٦٢]. دیسان لە ١٩٢٣/٥/٨دا، بەیاننامەیان بەسەر سلێمانیو ناوەندی قەزاکاندا بەردایەوە، تا بزانرێ حکوومەت نیازیەتی سلێمانی بگرێتەوە، بۆیە ئەوی لەڕوویدا ڕابوەستێ سزای قورس ئەدرێ. مەندووبی سامیی ئینگلیزو حکوومەتی عیراق، بۆچوونیان لەسەر وەزعەکە زۆر جیاواز بوو: هێزی دۆبس پێی وابوو تا شێخ ئازاد بێ، هیچ ئیدارەیەکی سلێمانی مانەوەی لە چارە نانووسرێ. بۆیە ئەگەر نەکوژرێ یا دیل نەکرێ، باشتر وایە لەگەڵیدا ڕێك بکەون. هەرچی حکوومەتی عیراقیشە، نەك هەر ڕاگەیاندنەکەی ١٩٢٢/١٢/٢١ی خۆی بیر چووبوەوە، کە دانی تێدا نابوو بە مافی کورددا بۆ پێکهێنانی حکوومەتێکی کوردی لە چوارچێوەی عیراقدا، بگرە سووریش بوو لەسەر بەتوندی بەستنەوەی سلێمانی بە بەغداوە[٣٦٣].

ئەدمۆندز، لەڕێی عەلی کەمال بەگی موعاوینی پۆلیسی کۆیەوە، ئامادەییی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ شێخدا نیشان دا. شێخ، ١٩٢٣/٥/١٠ سالح زەکی ساحێبقڕانی بە نامەوە نارده کۆیە، بەڵام لەوێوە برایە بەغدا.

---

[٣٦٢] شێخ مەحمودی قارەمان ودەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب٢، ل٤٩٥-٤٩٦.

[٣٦٣] کرد وترك وعرب، ص٢٩٤.

مەندووبی سامی بە نامە شێخی ئاگادار کردەوە کە یا بێتە بەغدا بۆ قسەکردن لەسەر داهاتووی کورد، یان بچێتە لای ئەفسەری سیاسیی تەك ئەو هێزەی ئینگلیز کە پەلاماری سلێمانی ئەدا؛ داوایشیان لێ کردبوو بچێتە بەغداو لێی جێگیر ببێ، بەرامبەر بەوە هوموو موڵکەکانی بدەنەوە، شێخ ملی نەدا[٣٦٤]. ئەوە بوو دواتر ساڵح زەکی لە (پیران) پەیوەندیی پێوە کردەوە، بەڵام گومان لە نیازپاکیی کراو گیرا، لەگەڵ عەزیز قەزازو ئەمین ڕەواندزیو فایەق کاکەمینی ئەفسەرانی هاوبۆچوونیو شێخ سەلامی شاعیردا، کە ئەو سەردەمە کاتێك ناوچەکە چۆڵ کرا دەستگیر کران، بە بەندکراوی خرانە ئەشکەوتی (سیاکوڵە)[٣٦٥].

هێزە تازەکەی ئینگلیز کە بۆ گرتنی سلێمانی تەرخان کرابوو و ستوونی کۆیکوولی پێ ئەوترا، عەقید ڤنسنت فەرماندەی بوو، بریتی بوو لە یەکەی کامیرۆنیو لیوای وێست یۆرکشایەرو فەوجی سیخ ١٣/١و بەتەرییەی تۆپخانەی چیاییی ئەمبالای بە وڵاخ هەڵگیراوو هەندێ سۆراخکەر، بە پاڵپشتی هێزی ئاسمانیی بریتانیا؛ ١٩٢٣/٥/١٤ گەیشتە چەمچەماڵ. ئەمین ئەفەندیی ڕەشید ئاغای هەمەوەندی لێ کرا بە قایمقام، وەهاب بەگیش بە بەڕێوەبەری ناحیەو چەند پۆلیسێکی غەیرە نیزامیی بۆ دانرا. شێخ هەر ئەو ڕۆژە نامەیەکی بۆ فەرماندەی ستوونەکەی ئینگلیز نووسی کە لە چەمچەماڵ نەیەتە پێشەوە، چونکە بەرەنگاری نەبێتەوە. لە جاسەنەوە هاتە سلێمانیو ئەمجا تاسڵووجە، بەڵام بۆردومانی توندی

---

[٣٦٤] الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، ص١٧٠-١٧١.

[٣٦٥] چیم دی، ب٢، ل٣٠، ٤١؛ جمال بابان، مذكرات علي كمال عبدالرحمن، شركة الخنساء للطباعة المحدودة- بغداد، ٢٠٠١، ص١٢-١٤.

فرۆکەکانی ئینگلیز ناچاری کرد بکشێتەوە. ڕۆژی ٥/١٥یش جاسەنەی چۆڵ کرد، بەڕێگەی (شێخ باخ)دا چووە ماوەتو شاربازێڕ، دواجار لە دێی (پیران)ی سەر سنوور گیرسایەوە[٣٦٦]. هاوکات برووسکەیەکی بۆ هەموو بالوێزانی بیانی ناردە تاران، نارەزایی ی تێدا دەربڕی دژی چەوساندنەوەو سەرکوتکاریی ئینگلیزو داوای لیکردن یارمەتیی بدەن. ئەم بانگەوازەی تێدا کردووە:

((لە جەنگی جیهانییەوە ئێمەی دانیشتوانی کوردستانی جنووبی هەمیشە داوا لە ئینگلیزەکان ئەکەین دان بە مافە نەتەوەییەکانماندا بنێن. هێزەکانی بریتانیا ولاتەکەمانیان وێران ئەکەن و خەڵك ئەکوژن، ڕێی نارەزایی دەربڕین و سکالاکردنمان نادەن ... دانیشتوانی کوردستان دوچاری بۆردومانی فڕۆکەو هێرشەکانیان ئەبن. تەنانەت نزیکەی ٢٠ خێزان بە ناچاری و بە زەبری توندوتیژی سلێمانییان چۆڵ کردووەو موڵك و ماڵێکی زۆر بە تالان براوەو ولاتەکەمان خاپوور کراوە. ئێمە دادپەروەریی مرۆدۆستانەو ویژدانمان بەرامبەر بەم زوڵم وزۆرە ئەوێ))[٣٦٧].

---

[٣٦٦] کرد وترك وعرب، ص٢٨٧، ٢٩٦؛ چیم دی، ب٢، ل٣١؛ عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، ص٣١٣، ٣١٦ (لە ژمارە ١٠٠ی ڕۆژی ١٩٢٣/٧/٢٠ی ڕۆژنامەی "العالم العربي"یەوە وەرگیراوە).
خوالێخۆشبوو ئەحمەد خواجە ئەو دێیەی بە (برنجە)ی هەورامان نووسیوە، بەڵام زانیاریی تۆمارکراوی سەردەمەکە بە (پیران)ی داناوە. من زیاتر (پیران)م پێ ڕاستە، بە دووری نازانم زەین و تەمەن ئەحمەد خواجەی بە هەڵەدا بردبێ، کاتێ سالانێك لەوەبەدوا ئەو بیرەوەریانەی نووسیوەتەوە.

[٣٦٧] الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، ص١٧٥؛ عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، ص٣١٧؛ چیم دی، ب٢، ل٣٣-٣٦.

"عـارف صـائيب"ی كـاتبی مابـەين، ئێـوارەی ١٩٢٣/٥/١٥ لـە دێی قەرەچەتان غافڵكوژ كرا؛ وترا محەمەد ئاغای سەیدەبچكۆلە دەستی تێدا هەبوە. هۆیەكەی ساغ نەبوەوە. شێخ یەكجار پێی دڵگران بوو. عارف شاعیرو نووسەرێكی دڵسۆزو كوردپەروەر بوو، گەلێ كارو فەرمانی گرنگی شێخی بە لەخۆبوردوویی و ژیرانە بەجێهێنابوو؛ لەوانە، پێشتر بە ڕاسپێری لەگەڵ ڕەشید ئەفەندیی ئەمین ئاغای هەمەوەنددا بە نامەی ١٩٢٣/١/٢٠ی شێخەوە چووبوونە تەورێز بۆ مسۆگەركردنی پشتیوانیی ڕووس[٣٦٨].

هێزەكـانی ئینگلیـز كەوتنـە جـوولان بـەرەو سـلێمانی، ٥/١٦ گەیـشتنە سەرچنار. ڕۆژی پێشتر ٥/١٥ بە فڕۆكـە نامـە بۆ گەورەپیاوانی شـار خرایـە خوارێ. ئـەوانیش ٥/١٦ چوونە سەرچنار. ئەدمۆندز هـەمان ڕۆژ لەگـەڵ ئـەو سەرگەورانەدا هاتە ناو شار؛ ئەحمەد بەگی تۆفیق بـەگی كرده سەرپەرشتی گـشت دائیرەكـان، شـێخ قـادری حەفیـد بـە بەرپرسـی ئاسایـشی گـشتی، پۆلیسیش مەجید ئەفەندیی كانێسكان بەڕێوەبەری پێشوو ڕێكیخستەوە. ئەدمۆندز چووە ناو دائیرەی ملووكانە كە لە بینای مەكتەبی ئەعدادیدا بوو، لە ژوورەكەی شێخدا وێنەی لەچوارچێوەگیراوی بە دیوارەوە داكوتراوی شێخ و ئاڵایەكی كوردیی بینـی، لەگـەڵ تـاجێكی كلێشەداردا كـە ئامادە كرابـوو بۆ جیاكردنەوەی لە هەر ئاڵایەكی تری شاهانە، بە ئاڵاكەوە چەسپ بكرێ. ئـەو ئاڵایـەی، لەگـەڵ قـاڵبی پـووڵدروستكردن و بۆیاخەكەیدا كـە دواتـر دەسـتی كەوتن، بردەوە بۆ وڵاتی خۆی[٣٦٩].

---

[٣٦٨] چیم دی، ب٢، ل٢٦؛ م. ڕ. هاوار، هەمان سەرچاوە، ب١، ل٤١٨-٤٢١؛ سدیق ساڵح، شەجەرەكەی بنەماڵەی صائیب، "پەیڤین" (گۆڤار)، ژ٦، حوزەیرانی ١٩٩٩.

[٣٦٩] كرد وترك وعرب، ص٢٩٧.

ئەدمۆندز ٥/١٨ بە ستوونێکی یەکەی پیادەی کووکەوە ڕووی کردە (جاسەنە). دەمی ئەشکەوتەکە بە وشکەکەڵەك هەڵچنرابوو، تا نەچوونە بەردەمی نەیان دی. لەو نزیکانە قەرەوێڵە ئاسنەکەی شێخ و چەند کورسییەکی هاوشێوەی هی چایخانان و بڕێکی زۆر ئالفی ولاخ؛ لە ماڵێکی ئەوناەیش دوو ئالای شاهانە و ئامێرێکی تەلەفۆنی بەکارهاتوو بۆ پەیوەندیکردن بە شێخ باخ و قەمچووغەو دووکانەوەو چاپخانەکەو مەخزەنێکی ئاردیان دی؛ بیست باریان لەو ئاردە هەڵگرت[٢٧٠]. هەر لەو ئەشکەوتەدا دووەم ژمارەی دەستخەتی ڕۆژنامەی "بانگی حەق" بەجێهێڵرابوو، کەوتە دەست ئەدمۆندز، پاراستی و هەر لەوەبەتر بردیەوە بۆ بریتانیا[٢٧١] !

هێزەکانی ئینگلیز دەستیان بە کێومالی ناوچەکانی دەوروبەری سلێمانی، بەتایبەت سووورداش و مەرگە، کرد. پاش دڵنیابوون لە نەبوونی مەترسی و بەرەنگارییەکی بەرچاو، ئەمجا لە ٢٨/٥دا چوونە ناو شار[٢٧٢]. لەوکاتەیشەوە دووەم دەورانی حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز لە شاردا دەستی پێکرد.

---

[٢٧٠] هەمان سەرچاوە، ل٢٩٧-٢٩٨.

[٢٧١] سی. جەی. ئەمۆندز، ڕۆژنامەیەکی کوردی "ڕۆژی کوردستان"، لەئینگلیزییەوە وەرگێڕانی سەلمان عەلی، "ڕۆژنامەنووسان" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ١، بەهاری ٢٠٠٢، ل٧٧-٨٣.

[٢٧٢] كرد وترك وعرب، ص٢٩٦، ٢٩٧، ٣٠١، ٣٠٤.

هەر ئەو مانگە مەندووبی سامی ئەم بەیاننامە ڕەسمییەی لە ڕۆژنامەکانی بەغدادا بڵاوکردەوە: ((زانیومانە شێخ مەحموود گەلێك نامەی ناردووە، دەریخستووە کە لایەنگری حکوومەتەو حەز بە خزمەتی ئەکات. لە وەڵامیاندا پێی وتراوە: ئەگەر بێتە بەغدا، تووشی سزا نابێ لەسەر بەرەنگاریی حکوومەت، ڕێیشی ئەدرێ لەگەڵ خێزانەکەیدا لە بەغدا دابنیشێ. ئەوسا بەوپەڕی ڕێزەوە مامەڵەی لەتەکدا ئەکرێو ئازادیی ئەدرێتێ، مادامێکی هەوڵ نادات بەبێ مۆڵەت بەغدا بەجێ بهێڵێ))[273].

ڕۆژی ٥/٢٩ "عەبدولموحسین ئەسسەعدوون"ی سەروەزیرو صەبیح نەشئەتی ئەمینداری پایتەختو کۆرنوالیسی ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ، بە فڕۆکە هاتنە سلێمانی، تا وەکوو لیوایەك لەڕووی ئیدارییەوە بیخەنە سەر عیراق. ٦/٢ "هێزی دۆبس"یش گەیشت. لەگەڵ گەورەپیاوانو سەرانی شاردا کۆبوونەوە. ئێوارەی ١٩٢٣/٦/٢ مەندووبی سامی، بە قسەی مێجەر ئەدمۆندز، لە خانوەکەی میرزا فەرەج کە ماڵی مەئمووری سیاسیی حکوومەتی بریتانیا بوو، لەگەڵ شێخ قادری حەفیدو شێخ عەبدولکەریمو بابەکر ئاغای پشدەریو ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگو کەریم بەگو ئەمینی ڕەشید ئاغاو مەجید ئەفەندیی حاجی ڕسووڵ ئاغاو حاجی ڕەشوان بەگو حاجی مەلا سەعید کەرکووکلی زادەو حاجی سەعید ئاغاو مستەفا پاشا یاموڵکیدا کۆبووەوە. ئەدمۆندز پێشنیاری کرد ئەنجومەنێکی ئیدارەی کوردی بە سەرۆکایەتیی گەورەیەکی شار کە مەندووبی سامیی ئینگلیزو مەلیك فەیسەڵ بەدڵیان

---

[273] الکرد وکردستان ...، ص١٧٢.

بێ، دابمەزرێنرێ. کوردی زمانی ڕەسمیی لیوا، سلێمانیش لیوایەکی عیراق بێ، پارەی داهاتی کۆکراوەی باجی خۆی بۆ ڕاییکردنی کاروباری بەڕێوەبردنی لیوا تەرخانو خەرج بکرێ. نوێنەرانی لیوایش بنێردرێنە ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق، بۆیان هەبێ سوێندی لایەنگریو دڵسۆزی بۆ مەلیك فەیسەڵ نەخۆن[٣٧٤].

ئەو پێشنیارە، ڕۆژی ٦/٣ لە کۆبوونەوەی وەفدەکەو گەورەکانی شاردا بەرچاو خرا، لایەنی کوردی بڕیاری پەسندکردنی دا، ئەگەر مەندووبی سامی پێی قایل بێ، بە مەرجێك هێزەکانی ئەوکاتە یا هێزێکی هێندەی ئەوان لە شاردا بمێنێتەوە تا ئاسایشو نیزام بەرقەرار ئەبن. مەندووبی سامی بە مانەوەی ئەو هێزانە ڕازی نەبوو[٣٧٥]، چونکە حکوومەتی بریتانیا دووپاتی کردبوەوە کە ئەبێ هێزەکانی وشکانیی ناو عیراق کەم بکرێنەوە بۆ شەش فەوج. ئەو بڕیارە لە ١٩٢١دا درابوو، بەڵام ڕووداوەکانی کوردستان جێبەجێکردنەکەییان دواخست، بەتایبەت پاش ئاڵۆزبوونی پەیوەندی لەگەڵ تورکیادا کە هەڕەشەی لە سنووری لای باکووری ڕۆژاوای عیراق ئەکرد. هەرچەندە عەبدولموحسن ئەسسەعدوون داوای لە مەندووبی سامی کرد هێزەکانی بۆ دوو یا سێ مانگی تر بهێڵێتەوە تا تەشکیلاتی ئیداری لە شاردا دائەنرێ، قایل نەبوو[٣٧٦]. بەوپێیە ستوونی (کۆی) بڕیاری لێدرا ناوەندی حوزەیران بکێشرێتەوە. وەفدەکە

---

[٣٧٤] هەمان سەرچاوە، ل١٧٢– ١٧٣.

[٣٧٥] هەمان سەرچاوە، ل١٧٤.

[٣٧٦] کرد وترك وعرب، ص٣٠١، ٣٢٢.

ڕێگەچارەیەکی بۆ نەدۆزرایەوە، هەمان ڕۆژ بە فڕۆکە چوونەوە بۆ بەغدا[٢٧٧].

هەر ئەو سەروبەندە مستەفا پاشا یامولکی فریاکەوت یەك ژمارە (١٤)ی ڕۆژنامەی "بانگی کوردستان"، وەك دەرئەکەوێ، بەتەنیا دەریکاتەوە. کەس لە نووسەرەکانی پێشوو هاوکاری نەبوە. ئەحمەد موختار جاف لە حوزەیرانی ١٩٢٣دا کرایە قایمقامی هەڵەبجە، حامید بەگی مەجید بەگ بە یاریدەدەری. شێخ عارفی سەرگەڵوو و شێخ یووسفی شەدەڵەی بەڕێوەبەری ناحیەی سوورداشیش لەو دەمەدا لە شێخ مەحموود جیا بوونەوە[٢٧٨].

شێخ، ڕۆژی ١٩٢٣/٦/١٠ نامەیەکی دایە حکوومەتی ڕووسیا، لە ژمارەی ١٩٢٣/٦/٢٢ی ڕۆژنامەی "پراڤدا"دا بڵاوبووەوە؛ پێشتریش مەزبەتەیەکی بە ئیمزای خۆیو سەعید کەریمو ڕەزا بەگو عەبدولکەریمو حاجی ڕەسووڵو چەند کەسێکی تر بۆ ناردبوو. سێیەم نامەیشی، لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٢٣/٧/٢٧ی پراڤدا دا بڵاوکرایەوە[٢٧٩].

هێشتا هیچ ئیدارەیەکی ڕێکوپێك دایین نەکرابوو، کەسانێکی وایش بۆ هێزی لیڤی دانەنرابوون، کە بە ئەنجومەنی کاتیی بەڕێوەبردنی شار وترا: ئینگلیزەکان سێ ڕۆژی تر ئەچنەوە بۆ کەرکووك[٢٨٠]. ئەوانیش لەبەر ئەم

---

[٢٧٧] کرد وترك وعرب، ص٢٠١؛ بانگی کوردستان، ژ١٤، ٨ حزیران ١٩٢٣، ل٤.

[٢٧٨] هاوار، ب١، ل٥٠٥، ٥٣٤.

[٢٧٩] جليلي جليل وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة عبدي حاجي، بيروت، ١٩٩٢، ص١٢٥.

[٢٨٠] کرد وترك وعرب، ص٢٠٤.

مەسەلەیە، چونکە حکوومەتی عیراقیش قەزاو ناحیەکانی ڕانیەو چەمچەماڵو زابی لە سلێمانی جیاکردەوەو بەستنی بە هەولێرو کەرکووکەوە تا توندتر کۆنترۆڵی سلێمانیو ناوچەکانی ژێر ئیدارەی بکات، لە ٦/١٤دا دەستیان کێشایەوە، شار بەبێ ئیدارەو دەسەڵات مایەوە[٢٨١].

ئەدمۆندز ویستی پرۆژەیەکی پێشتر بەرچاوخراوی خۆی زیندوو بکاتەوە، ئەویش ئەوەبوو ٣٥٠ سەرباز بهێڵێتەوە بۆ پاراستنی بارودۆخی ئاسایشی شار. مەندووبی سامی پشتگیریی نەکرد. بۆیە گەورەپیاوانی ئاگادار کردەوە کە خۆیان بەبێ یاریدەی ئینگلیز پارێزگاریی شار بکەن. هەر خۆیشی ئەمین ئەفەندیی ڕەشید ئاغاو یاریدەدەرەکەیو مەجید ئەفەندیی کانێسکانو چەند پیاوێکیانی گرت، لەبەر ئەوەی پەیوەندییان بە زەبروزەنگو چەتەگەریی دەرەوەی شارۆچکەی چەمچەماڵەوە هەبوو؛ وەهاب بەگی خستە شوێنی، کە شارەزای کاروباری ناوچەکەو باج بوو، هەندێ شتی دزراویشی هێنایەوە[٢٨٢].

ئەوەبوو ڕۆژی ٦/١٧ دەوری دوو هەزار کەسێکی شار تاکە تاکە یا پێبەپێی هێزەکەی ئینگلیز لە (ڕۆیشتنە عوموومیەکە)[٢٨٣]دا کشانەوە،

---

[٢٨١] هەمان سەرچاوە، ل٣٠١-٣٠٢؛ الکرد وکردستان ...، ص١٧٤.

[٢٨٢] کرد وترك وعرب، ص٣٠٢، ٣٠٥.

[٢٨٣] ئەو شارچۆڵکردنەی ئەوانە، لەناو خەڵکی ئەوکاتەو ڕۆژنامەوانیی سەردەمەکەدا بە (ڕۆیشتنە عوموومیەکە) ناسراوە. بۆ ئەوە بڕوانە: حاجی مصطفی پاشا، "ژیان" (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ١٨، ٢٧ مایس ١٩٢٦، ل١- لە:

زۆریـان پـەنایان بـردە بـەر گونـدەکان. چـەند بۆسـەیەکیان لـە ڕێگـە بـۆ نرایـەوەو لێیـان ڕووت کرایـەوە[٢٨٤]. بەشێکیان لێ گەیشتە کەرکووكو لێی جێگیر بوون. بەوشێوەیە حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز، ئەمجارە کەمو زۆر مانگێکی نەخایاند.

سلێمانی چۆڵ کرا، چونکە ئەو مەجلیسی تەئسیسییە کە ئەویسترا پێك بهێنـرێ بـۆ دانـانی دەسـتوورو باوەڕهێنـان بـە پەیماننامـەی تـازەی نێـوان بریتانیـا و عـیراق، بـە دڵـی ئینگلیزەکـان نەئـەبوو ئەگـەر تـەنیا نوێنـەرانی هـەردوو ویلایـەتی بەغداو بەسـرەو چـەند نوێنـەرێکی غـەیرە کوردیان تێدا بێ. بۆیە پێویست بوو کوردی باشووری کوردستان بەشدار بکرێنو هـان بدرێن نوێنـەر بنێـرن، تـا تـرازووی لایـەنگرانی پەیماننامەکە قورستر بێ، لەبەر ئـەوەی کورد دوای لەدەسـتدانی ئاواتە نەتەوەییـەکانی خـۆی نەترسـا بخرێتـە ژێـر سـایەی حـوکمێکی تـەواو عـەرەبیی دەسـت کـراوە. دیـارە بەشـداریی کـورد تـای ترازوەکـەی قورسـتر ئـەکردو زامنـی هێـشتنەوەی دەسـەڵاتی بریتانیـا بـوو لـە عیراقـدا. ئەمـە نهێنـیی ئـەو ئاڵوگۆڕە تەکتیکییە کوتوپڕەی بۆچوونی ئینگلیز بوو، کاری نـەکردە سـەر هێڵی گشتیی سیاسەتی کۆکس کە لکاندنی کوردستانی جنووبی بوو بە دەوڵەتی عیراقەوە. هەر ئەوەیش هۆی دەرچوونی بڕیارێکی لەو شێوەیەی ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق بوو[٢٨٥].

---

ڕەفیـق سـاڵح، ڕۆژنامـەی "ژیـان" ژمـارە (١-٨١)، یەکـەم بـەرگ، لێکۆڵینـەوەی سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠٢.

[٢٨٤] کرد وترك وعرب، ص٣٠٢.

[٢٨٥] يقظة الكرد، ص٢٧٢، ٢٧٣.

### ١. ٣. ٢. دەورانی سێیەم حکوومەتی کوردستان؛

.شێخ کە ئەودەمە لە دێی (خەمزە) ی ژووروری شار لە چاوەڕوانیدا بوو، هەر زوو کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەندی بە هێزێکەوە ناردە سلێمانی" ئەویش خۆیی کردە حاکمی شارو داوای لە خەڵك كرد ڕێزی ئاسایش و نیزام بگرن؛ بڵاوی کردەوە کە لایەنگران و هاوکارانی ئینگلیز سزائەدرێن، توجاڕانی توتنیشی ڕاسپارد هەر بڕە توتنێکیان بە دەرەوەی شار فرۆشتووەو ناردوویانە، باجەکەی بدەن[٣٨٦].

شێخ خۆیشی پاشتر لە ١١ی تەمووزی ١٩٢٣دا گەیشتەوە ناو شار[٣٨٧]. هەمان ڕۆژ ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق ئەم بڕیارانەی دا:

١- بەتەما نییە فەرمانبەری عەرەب لە قەزاکانی کورددا دابمەزرێنێ، هێندێ شارەزایی ی تەکنیکی نەبێ کە لە ناوچەکەدا نین.

٢- هاووڵاتیانی کورد لە بەکارهێنانی زمانی عەرەبیدا بۆ گفتوگۆکردن ئازادن، ڕێیشیان ئەدرێ زمانی کوردی لە گفتوگۆدا بەکار بهێنن.

---

[٣٨٦] الكرد وكردستان ...، ص١٧٥.

[٣٨٧] كرد وترك وعرب، ص٣٠٩.

سەرکردەکانی وەك سەید محەمەد ئەفەندی و کەریم بەگ و شێخ محەمەد غەریب زووتر خۆیان گەیاندەوە ناو شار، هەتا ناویان لە یەکەم تۆماری داهات و خەرجی ی مانگی حوزەیران بەدواوەی شارەوانی ی سلێمانیدا هێنراوە (بڕوانە: دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە، "ژیان"، ژ٧، ٤ مارت ١٩٢٦، ئەڵقەکانی تری لە یەکەم بەرگی "ڕۆژنامەی ژیان"دا).

[٣٨٧] تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ص١٦١.

٣- حکوومەتی عیراق پەرۆشی‌ی بێ‌ئەندازەی خۆی جەخت ئەکاتەوە بۆ پاراستنی مافی خەڵك‌و تیرە دینی‌و مەدەنیەکان لەو قەزایانەدا[٣٨٨].

کە مەندووبی سامیش بەوەی زانی، ئەم بڕیارانەی دا:

١- لەبەرئەوەی سەری نەگرت سلێمانی بخرێتە سەر عیراق‌و خەڵکی شار ڕازی نەبوون، پێویستە سلێمانی بچێتەوە دۆخی جارانی پێش هێرشی ئینگلیز بۆ سەر شێخ مەحموود. بۆیە هیچ جۆرە پەیوەندییەك لەنێوان شێخ‌و حکوومەتی عیراقدا نابێ. مەندووبی سامی لەوبارەیەوە فەرمان دەرئەکات‌و وەکیلەکەی بۆ کاروباری سلێمانی وەك موفەتیشی ئیداری‌ی کەرکووك درێژە بە کارەکانی ئەدات.

٢- بەشی سەرووی لیوا کە نەخراوەتە پاڵ ئیدارەو کۆنترۆڵی حکوومەتی عیراق، هەمان شت ئەی‌گرێتەوە. ئەو ناحیانەیش کە لە سلێمانی جیا کراونەتەوە، کێشە گرنگەکانیان لەلایەن موفەتیشی ئیدارییەوە ئەدرێنە وەزیری ناوخۆو وێنەیان ئەخرێتە بەرچاوی مەندووبی سامی" وەزیری ناوخۆ بە ڕاوێژی مەندووبی سامی کارە گرنگ‌و گەورەکانیان جێبەجێ ئەکات.

٣- ئەبێ بە شێخ مەحموود بوترێ: ئێستا وازی لێ ئەهێنرێ بە مەرجێك لە سنووری ناوچە ناوەندیەکە واوەتر نەچێ[٣٨٩].

---

[٣٨٨] تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ص١٦١.

[٣٨٩] الكرد وكردستان...، ص١٧٥-١٧٦.

بەوپێیە ڕێ درا شێخ مەحموود لە ناوچەی سلێمانیدا بمێنێتەوە، بە هیوای ئەوەی کە کێشەکەی لەگەڵدا بەلایەکدا بخەن. مەندووبی سامی ئەوانەی بە نامەی شەخسی گەیاندە شێخ. هەر تەمووزی ۱۹۲۳یش پێی ڕاگەیاند: ڕێوشوێن دانراوە بۆ جیاکردنەوەی قەزاکانی ڕانیەو قەڵادزێو چەمچەماڵو هەڵەبجەو قەرەداغو سەنگاوو ناحیەی ماوەت، هەروەهایش نابێ دەست وەربداتە کاروباری دێهاتی ساداتی سەرگەڵوو. ئەگەر پێمل نەبوو، توندترین کردەوەی بەرانبەر ئەنوێنرێ[۲۹۰].

شێخ زۆر پێنەچێ تەمووزی ۱۹۲۳ سێیەم تەشکیلاتی حکوومەتی بەناوی مەجلیسی میللی (عوموومی)یەوە لە (ڕونەسای دەوائیر)و (ئەشرافی مەملەکەت) پێك هێنابێ، بەم شێوەیە:

ئەندامە ئاساییەکان (ئەعضای طەبیعی):

نایبی حکوومەتو ڕەئیسی مەجلیسی میللیو ڕەئیسی داخلییە:

شێخ محەمەد غەریبی شێخ مارفی قازانقایە،

ڕەئیسی مالییەو گوومرگ: سەید ئەحمەدی بەرزنجی (مەرەخەس)،

ڕەئیسی مەحکەمە: مەلا مەعرووفی مەلا ڕەسووڵی سیری،

ڕەئیسی تیجارەتو مەعاریفو نافیعە: حاجی مەلا سەعید ئەفەندی کەرکووکلی زادە،

قوماندانی عەسکەری کوردستان: ڕەزا بەگ،

ئەشرافو مونتەخەبی ئەهالی:

محەمەدئاغای عەبدوڕڕەحمان ئاغا

---

[۲۹۰] هەمان سەرچاوە، ل۱۷٦.

محەمەد بەگی قادر پاشا

حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم

مەلا حسێنی پیسکەندی

حاجی برایم ئاغای خەفاف

حاجی ئەمینی حاجی عەزیز

حاجی ڕەحیم

حەسەن بنەشێ.

مودیری ئەمنییەتی عموومی- قیدەملی یووزباشی سەید ڕەزا

دائیرەی ملووکانەیش بەم شێوەیە ڕێك خرایەوە:

یاوەرو سەرکاتب- سەید ئەحمەد ئەفەندی،

کاتب- ئەحمەد سەبری (خواجە) ئەفەندی،

زابتی ئەمر- مولازم ئەووەل ماجد مستەفا ئەفەندی،

قوماندانی بلووکی مەعییەت- محەمەد ئەفەندی،

مەئمووری موصارەفاتی دائیرەی ملووکانە- شەریف ئاغا [مەبەست دەرویش شەریفە]،

مودیری موسافیرخانە- شەمسەدین [کوڕی شێخ قادری شێخ سەلامی قازییە، دواتر بە حەسەن فەلاح ناسرا][291].

---

[291] "ئومێدی ئیستیقلال"، سلێمانی، ژ١، ٢٠ ایلول ١٣٣٩، ل٢.

جێی باسە، ئەم تەشکیلاتە لە ئەدەبیاتی سیاسیی قۆناغەکەدا، بە (تەشکیلاتی ثانی) ناسراوە. تەشکیلاتی یەکەمیش، ئەوی دووەم حکوومەتی کوردستانە. هەرچی دەورانی یەکەم حکوومەتی کوردستانیشە، تەشکیلاتی

محەمەد بەگی قادر پاشا
حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم
مەلا حسێنی پیسکەندی
حاجی برایم ئاغای خەفاف
حاجی ئەمینی حاجی عەزیز
حاجی ڕەحیم
حەسەن بنەشێ.
مودیری ئەمنییەتی عموومی- قیدەملی یووزباشی سەید ڕەزا

دائیرەی ملووکانەیش بەم شێوەیە ڕێك خرایەوە:
یاوەرو سەرکاتب- سەید ئەحمەد ئەفەندی،
کاتب- ئەحمەد سەبری (خواجە) ئەفەندی،
زابتی ئەمر- مولازم ئەووەل ماجد مستەفا ئەفەندی،
قوماندانی بلووکی مەعییەت- محەمەد ئەفەندی،
مەئمووری موصارەفاتی دائیرەی ملووکانە- شەریف ئاغا [مەبەست دەروێش شەریفە]،
مودیری موسافیرخانە- شەمسەدین [کوڕی شێخ قادری شێخ سەلامی قازییە، دواتر بە حەسەن فەلاح ناسرا][٢٩١].

---

[٢٩١] "ئومێدی ئیستیقلال"، سلێمانی، ژ١، ٢٠ ایلول ٣٢٩، ل٣.
جێی باسە، ئەم تەشکیلاتە لە ئەدەبیاتی سیاسیی قۆناغەکەدا، بە (تەشکیلاتی ثانی) ناسراوە. تەشکیلاتی یەکەمیش، ئەوی دووەم حکوومەتی کوردستانە. هەرچی دەورانی یەکەم حکوومەتی کوردستانیشە، تەشکیلاتی

قەڵـەمڕەوی دەســەڵاتی ئــەم سـێیەم حکوومەتــە، لەچـاو دوانەکــەی پێــشوودا، بەگــشتی بەرتەســك‌و قــەوارە بــچووك بــوو. شــێخ کۆتــایی‌ی تــەمووزی ١٩٢٣ دەســتی بەســەر قــەزاو ناحیــە جیاکراوەکانــدا گرتــەوە، ڕای‌گــەیانــد هێــزە مەزنــەکان دایاننــاوە بــە مــەلیکی کوردســتان. بــەڵام مەندووبی سامی بە فڕۆکە بەیاننامەی بۆ فڕێدایە خوارێ کە ئەوە ڕەت ئەکاتەوەو شێخ هیچ دەسەڵاتێکی بەسەریانەوە نییەو نایبێ. شێخ وەڵامی ئەوەی دایەوە، درێژەی بە کۆنتڕۆڵکردنی ئەو شوێنانە داو دەسەڵاتەکەی پەرەی سەند[٣٩٢].

پــەیمانی لــۆزان ڕۆژی ١٩٢٣/٧/٢٤ لــەنێوان هاوپــەیمانان‌و تورکیــادا مۆرکرا. ئیتر ئەبوو بریتانیاو تورکیا بەپێی دووەم بڕگەی سێیەم ماددە، هێڵــی ســنووری نێــوان تورکیــاو عــێراق دیــاری بکــەن. ئەگــەر نەیــشکرا، کێــشەکە بخرێتــە بــەردەم ئەنجومــەنی کۆمەڵــەی نەتــەوەکان. تــا بڕیــاری یەکجارەکیش ئەدرا، هــەردوو حکوومــەت بەڵێن بدەن هیچ جموجووڵێکی عەســکەری یــا ناعەســکەری نەکــەن بــارودۆخی ئەودەمــەی هەرێمەکــە (ویلایــەتی مووســڵ) بگــۆڕێ[٣٩٣]. واتــە حاڵ‌وبــاری کوردســتانی جنــووبی وەکوو خۆی هێڵرایەوە، حکوومەتی بریتانیایش ئەرکێکی وای بەرانبەر بە کــوردانی ئــەم پارچــەیە لــە ئەســتۆدا نــەما، تــا بتــوانن مــافی خۆیــان بــۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بەکاربهێنن[٣٩٤].

---

هاوچەشنی ڕیاسەتەکانی نەبوو، بەپێی شێوەی لیوای سەردەمی عوسمانی ڕێك خرابوو.

[٣٩٢] الکرد وکردستان ...، ص١٧٧.

[٣٩٣] الدکتور فاضل حسین، مشکلة الموصل، ص٣٨-٣٩.

[٣٩٤] کرد وترك وعرب، ص٢٨٢.

سەرەتای ئەم دەورە، ئەحمەد بەگو عیززەت بەگی وەسمان پاشای برای‌و حامید بەگ سەریان لە سلێمانی دا، دەریانخست لایەنگری مەلیکی کوردستانن[٣٩٥].

شێخ ١٩٢٢/٨/١٥ کاربەدەستانی ئینگلیزی ئاگادارکردەوە کە "تۆفیق جەلال"ی بە بەڕێوەبەری ناحیەی وارماواو حەسەن بەگی بەگزادەی جافیشی بە یاریدەدەری سەرۆکی هۆزی جاف دانـاوە[٣٩٦]. ڕۆژی ١٩٢٢/٨/١٦ ناوشار، بەتایبەتیش بارەگاکەی شێخ، لەبەرئەوەی گوایە شێخ دەستی وەرداوەتە ناوچە قەدەغەکراوەکان‌و بەتایبەت ماوەت، لە فڕۆکەوە بە بۆمبای ٢٢٠پاوەندی کە بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا بەکارهێنرا، بۆردومان کرا. شێخ یادداشتێکی ناڕەزاییی لەسەر ئەوە دایە مەندووبی سامی[٣٩٧].

هەر ئەو ڕۆژەیش شێخ حەمەغەریب بە هێزێکەوە چووە ناو هەڵەبجە، بەگزادەی جاف هیچ خۆگرییەکیان لەبەردەمیدا پێنەکرا. دەسەڵاتی ئینگلیز تەنیا لە بەشێکی وارماوای خوارووی زنجیرە چیای بەرانانی ناوچەی هەڵەبجەدا مایەوە کە بە کفرییەوە بەسترا[٣٩٨].

شێخ، چەندین نامەی تری بە شێخ عەبدولکەریم‌و شێخ عەبدولقادری سەنگاوو سەید ئەحمەدی بەرزنجی‌و شێخ محەمەد غەریبدا بۆ مەندووبی سامی لە بەغدا نارد" داوای لی‌کردن نوێنەرەکەی خۆیان بنێرنەوە بۆ سلێمانی. هەر ئەو

---

[٣٩٥] هەمان سەرچاوە، ل٣٢٢.

[٣٩٦] الکرد وکردستان ...، ص١٧٨-١٧٩.

[٣٩٧] هەمان سەرچاوە، ل١٧٧؛ کرد وترك وعرب، ص٣١٢.

[٣٩٨] کرد وترك وعرب، ص٣١٣.

ماوەیە شێخ محەممەد غەریبی بە نامەیەکەوە ناردە کەرکووك بۆ لای موفەتیشی ئیداریی کەرکووك؛ ڕایسپارد ئامادەیە لە کفری یا قادرکەرەم چاوی بە نوێنەرێکی ئینگلیز بکەوێ بۆ ووتووێژ، داواکەی ڕەت کرایەوەو شێخ محەممەد غەریبیش نەبینرا[399]. تشرینی یەکەمی ۱۹۲۳ دوو نێردراوی بە نامەی ۱/۱۰ی خۆیەوە ڕەوانەی بەغدا کرد. هێنری دۆبس ۱۹۲۳/۱۱/۱۲ وا وەڵامی دایەوە کە ئەبێ شێخ خۆی بێتە بەغدا تا چارەنووسی سلێمانیی لەگەڵدا باس بکرێ[400].

ڕۆژی ۱۹۲۳/۹/۲۰ یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی "ئومێدی ئیستیقلال" لە سلێمانی دەرکراو تا ۵/۱۵ / ۱۹۲٤ کە بیستوپێنج ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە، بوو بە زمانی حاڵی ئەو سێیەم حکوومەتەی کوردستانی جنووبی؛ ژمارە ۱-۳ ئەحمەد خواجە، ٤-۱۳ ڕەفیق حیلمی، ۱٤-۱٦ حسێن نازم مودیری مەسئوولی بووە. ژمارەکانی تری نەزانراوە کێ سەرپەرشتیی کردوون.

ئینگلیز کۆتایی ی ئەیلوولی ۱۹۲۳ هێزێکی تایبەتی سوارەی گەڕۆکی لە ۱۲۰ پۆلیس پێك هێنا، تا لەکاتی پێویستیدا لە هەر بەشێکی لیواکانی کەرکووك و سلێمانیدا بەکاریهێنرێن[401]. هەر لەو سەروبەندەدا حەمەخان و حەسەن بەگ و ئەحمەد بەگ لە سەرانی ڕۆغزایی، حەمەخان سلێمان لە سەرانی جاف سەریان لە سلێمانی دا[402].

---

[399] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، المصدر نفسه، ص۳۳۵.

[400] هەمان سەرچاوە، ل۳۲٦؛ الكرد وكردستان ...، ص۱۷۷-۱۷۸؛ یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل۱۱۱-۱۱۲.

[401] كرد وترك وعرب، ص۳۱٦.

[402] ئومێدی ئیستیقلال، ژ۳، ٤ تشرين اول ۱۳۳۹، ل٤.

شێخ محەمەد غەریبی ڕەئیسی مەجلیسی میللی، بڕیاری مەجلیسی بۆ لێبوردن لەوانەی کە لە (ڕۆیشتنە عومووومیەکە)دا ڕۆیشتبوون یا خراپەیان دەرهەق بە میللەتو وڵاتی خۆیان کردبوو، بەرز کردەوە. مەلیك مەحموودیش لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣دا بۆی نووسیوە: ((جوابی ٨ی تشرین ئەووەڵی ٣٣٨و ٥ ژمارە قەراری مەجلیسە ئەوانەی کە لەبەر خەوفی بۆمباردومان وە یاخود لەبەر ئەفعالی خۆیان سووئی ظەنییان بۆ حاصڵ بووەو بە واهیمە بە ماڵەوە هیجرەتیان کردووە غەیرەز ئەوانە کە لە ئەشکەوتەوە فیرار بوون من عەفوم ئیعلان کردبوون لەسەر تەکلیفی ئێوەو غایەی خۆم ئەمجارەیش عەفوەکەیان تیکرار ئەکەمەوە چونکە مەعلوومی جیهانە ئەم فیداکارییە کە هەتا ئێستا ئیقتیحام کراوە صرف بۆ تەرەقی و سەعادەتی ئەم میللەتەیە غەیری ئەم جیهەتە مەشرووعە نەبێ هیچ ئەمەلێکی تر تەعقیب نەکراوە[٤٠٣].

مولازم مەجید ئەفەندی، لەبری ڕەشید زەکی کابان کە نەیکرد، بە ئیرادەی ملووکانە دامەزرا بە موعەللیمی ڕیازیاتی مەکتەبی ئەعدادیی مەحموودی. شێخ سەعید ئەفەندی بە موعەللیمی مەکتەبی ئەعدادی هێڵرایەوە. ماجد مستەفا و سەید حەسەن ئەفەندی، لەپاڵ وەزیفەی عەسکەرییاندا، بەخۆڕایی کەوتنە دەرسوتنەوە لە قوتابخانەی ئەعدادی[٤٠٤].

٢٢ی تشرینی یەکەم بە ئیرادەی ملووکانە پشوو درایە هەموو دائیرەکان؛ لە مزگەوتی گەورە مەولوود خوێنرایەوە. نان خورا، شەربەتو قاوەو جگەرەیش بەشرایەوە. پاشان عەبدوڵڵا عادیل ئەفەندیی ئەفسەرێکی عەسکەری کوردستان

---

[٤٠٣] هەمان سەرچاوە، ژ٤، ١١ تشرین اول ١٣٣٩، ل٤.

[٤٠٤] هەمان سەرچاوە، ژ٤، ل٤" ژ٥، ١٨ تشرین اول ١٣٣٩، ل٤.

نوتقێکی بەلیفی ئیراد کرد. هەر بەو بۆنەیەوە، بە ئیرادەی ملووکانە لە هێندێ زیندانی بوردراو ئازاد کران[405]، لەوانە ئەو ئەفسەرو کسانەی کە پێشتر لە دەرەوە گیرابوون[406]؛ لەناو ئەوانەدا، وەك ئەحمەد خواجە نووسیویە، ڕەنگە سالّح زەکی ساحێبقڕان تا کۆتایی‌ی ئەو دەورە بە بەندی یا دەست بەسەری هێلّرابێتەوە[407].

سەردار ڕەشیدی ئەردەلانی کە لەبەر ناکۆکیی لەگەلّ حکوومەتی ئێراندا پەڕیوەی ئەمدیوی کوردستان بووبوو، هاتە سلێمانی بۆ لای شێخ. شێخ لەلای ئێران بۆی تێکەوت، لێبوردنی بۆ وەرگرت وا کە لە تاران دابنیشێ[408].

هێزەکانی شێخ توانییان سەرکەوتنێکی دیاریکراو بەدست بهێنن‌و چەند ناوچەیەکی نزیکی سلێمانی بخەنەوە ژێر دەستی خۆیان. بەلاّم فڕۆکەکانی ئینگلیز لە بۆسەدا بوون بۆیان، بەتوندی بۆمبابارانیان کردن. شێخ بۆردومانی دێهات‌و شارۆچکەکانی بە پێشێلکردنی پەیمانی لۆزان دانا، گوشاری خستە سەر حکوومەتی بریتانیا و نێوەنێوی لایەنی تورکیی دا. بۆیە حکوومەتی تورکیا لە ١٩٢٣/١١/١٨دا نارەزاییینامەیەکی لەوبارەیەوە دایە مەندووبی سامی‌ی ئینگلیز لە ئەستەموولّ[409].

.برووسکەیەکی مەندووبی سامی لە ١٩٢٣/١٢/٧دا درایە ئەدمۆندز، پێشنیاری تێدا کرابوو کە هێزی ئاسمانی‌ی بریتانیا، دوای ئاگادارکردنەوە،

---

[405] هەمان سەرچاوە، ژ٦، ٢٥ تشرین اول ١٩٢٣، ل٣.

[406] چیم دی، ب٢، ل٥٤.

[407] چیم دی، ب٢، ل٥٤.

[408] هەمان سەرچاوە، ب٢، ل٤٩.

[409] عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، ص٣٣٦.

بۆردومانی سلێمانی بکات، چونکە شێخ چەند جارێك مەرجە سەپێنراوەکانی شکاندووە، گوایە هەر لەوەبەتر بەڵگە زۆرن کە نیازی دوژمنانەیشی هەن[410].

ئەحمەد بەگ و عیززەت بەگ کە بەپەلە گەڕانەوە بۆ هەڵەبجە، ڕۆژی ١٩٢٢/١٢/١٦ لەگەڵ عادیلەخانی دایکیاندا ئەدمۆندزیان لە دێی (پساركان)ی خوار (بتخانە)ی ناوچەی سەنگاو دی[411]. بەوە پەیوەندییان لەگەڵ ئینگلیزدا دامەزراندەوە.

سلێمانی، بە تایبەت ماڵی شێخ، ڕۆژی ١٩٢٣/١٢/٢٥ بە فڕۆکە بۆردومان کرا. مارشاڵ سێر جۆن ساڵموندی سەرکردەی هێزی ئاسمانیی بریتانیا لە عێراق، خۆی بە فڕۆکە بۆمبای گرتە ماڵی شێخ، هەر دەرگای دەرەوەی خانوەکە بەرکەوت. دوو فڕۆکەیان نزیك سەرچنارو لە دەربەندی تاسڵووجە پەکیان کەوت و نیشتنەوە. شێخ یەکەمیانی پاراست، دووەمیان بە دەستی کەریم بەگی هەمەوەند تێك شکێنرا. هەر ئەو فڕۆکەوانانەی ئینگلیزو ئەفسەری سیاسی، شەوەکەی بەبۆنەی جەژنی لەدایکبوونی مەسیحەوە ئاهەنگی خۆیان گێڕا. فڕۆکەکان، لەوەبەدوا تا ئاداری ١٩٢٤، چەندەها جاری تر بۆ هەڕەشەو چاوترساندن بە ئاسمانی شاردا سووڕانەوەو مانۆڕیان کرد[412].

دەسەڵاتدارانی ئینگلیز مارتی ١٩٢٤ فەرمانبەری مەدەنی و پۆلیسیان، بۆ دامەزراندنەوەی ئیدارە، ناردە هەڵەبجە. هێزێکی شێخ پەلاماری شارەکەی دا،

---

[410] هەمان سەرچاوە، ل٣٣٢ .

[411] هەمان سەرچاوە، ل٣١٦.

[412] هەمان سەرچاوە، ل٣٣٨؛ کەمال مەزهەر، گاڵتەوگەپ و گەمەکانی نێوان شێخ مەحموودو فڕۆکەوانە ئینگلیزەکان، "ڕۆشنبیری نوێ"، ژ١٣٦، ١٩٩٥.

سوارەکانی جافی ئەحمەد بەگی شکاند. دیسان دەسەڵاتی ئینگلیز کورتی هێنا تا دێی وارماوا. بەڵام لەشکری شێخ خورماڵو وارماوای باکووری بەرانانیشی گرت. ئیتر هەڵەبجە لە ١٩٢٢/١٠/١ بەدواوە هیچ ئەفسەرێکی سیاسی ی ئینگلیزی تێدا نەبوو، تا ئەدمۆندز ١٩٢٤/٤/٢١ بە فرۆکە گەیشتە ئەوێ[٤١٣].

شێخ قادری حەفید ئەم دەورەی حوکمی شێخ، لێی دوورکەوتەوە" تشرینی یەکەمی ١٩٢٣ لە دێی سێوسێنان گفتی بە ئەدمۆندز دابوو خۆی بۆ ئەندامێتی ی ئەنجومەنی دامەزراندن (المجلس التأسيسي)ی عێراق بپاڵێوێ[٤١٤]، ڕاست لەگەڵ عیززەت بەگی وەسمان پاشاو میرزا فەرەجی حاجی شەریف و ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگو محەمەد بەگی فەتاح بەگی جافدا بە ئەندامی ئەو ئەنجومەنە هەڵبژێردران کە ڕۆژی ١٩٢٤/٣/٢٧ کرایەوەو ١٩٢٤/٧/٢٦یش دوای تەواوبوونی ئەرکەکانی هەڵوەشێنرایەوە[٤١٥].

ئەم ناسراوانەی چین و توێژە جیاجیاکانی شار:

ئەشرافی مەملەکەت: محەمەد ئاغا، غەفوور ئاغا، حەمدی بەگی ڕەشید پاشا، ساڵح پاشا، محەمەدفوئاد بەگ، فەتاح بەگی حاجی ئیبراهیم بەگ، مەحموود ئەفەندی ی ڕەئیسی پێشووی شارەوانی، عەبدولفەتاح چەلەبی، مەجید بەگی حاجی ڕەسووڵ بەگ، عارف ئەفەندی ی حاجی حەسەن ئەفەندی، ئەمین ئەفەندی ی کاتبی مەسرەف، محەمەد بەگی فەتاح بەگ؛

---

[٤١٣] کرد وترك وعرب، ص٣٤٠، ٣٤١.

[٤١٤] هەمان سەرچاوە، ل٣٢٧.

[٤١٥] تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ص٢٠٥، ٢٢٨.

عولەمای کیرام: موفتی ئەفەندی، باباعەلی، مەلا حسێنی پیسکەندی، شێخ عومەری شێخ ئەمین، شێخ جەلال ئەفەندی، مەلا مستەفای کورد، مەلا خالید، شێخ لەتیف، حاجی مەلا ڕەسووڵ، مەلا مەحموودی حاجی عەلی؛

توجارِی مەملەکەت: حاجی سەعید ئاغا، حاجی مەلا محێدین، حاجی ئەمین کاکەحەمە، حاجی ئاغا فەتحوڵلا، حاجی فەتاح قادر، حاجی کەریم عەنبەرخان، حاجی مەلا سەعید شاڵی، حاجی حەمەڕەحیم، میرزا عارف کاکەحەمە، حاجی حەسەن حاجی مەحموودە ڕەش، تۆفیق ئەفەندی‌ی مەحموود ئاغا، حاجی ساڵح خەفاف، حاجی فەرەج قاسم، حاجی محەمەد کاک عەلی، حاجی ئیبراهیم ئاغا، ڕەشید ئاغا حاجی ئیبراهیم ئاغا، میرزا تۆفیق قەزاز؛

بازرگان: عەبدوڕڕەزاق حاجی مەحموود، مەلا ئەحمەد حاجی مەحموود، حاجی محێدین خاتوون، سدیق حاجی محەمەد قوربانی، عەلی ئەفەندی‌ی حاجی ساڵح، حاجی مەلا سەعید حاجی مەعرووف، حاجی مستەفا بەگ؛

ساداتی کیرام: سەید عەبدوڵلا ئەفەندی، سەید عەبدولکەریم ئەفەندی، سەید نووری ئەفەندی نەقیب، شێخ عەلی ئەفەندی سەرکار، شێخ ساڵح ئەفەندی قازی، شێخ محەمەد ئەفەندی گولانی، شێخ قادر ئەفەندی موفتی، خەتیب سەید عەبدوڵلا ئەفەندی؛

مووسەوی‌ی مەملەکەت: حاخام خواجە میرە ئەفەندی، خواجە ساڵح بنۆشێ، یەعقووب حەسەنە جوو، ئیسحاق پێنجوێنی، ڕەحیم لەیلێ زەڕەنگەر، عەزیز لەیلێ زەڕەنگەر، باباقەرتاغی‌ی بازرگان، حەسەن بنۆشێ، سەلمان سەڕاف، ئیسحاق موعەللیم؛

عـەتاری مەملەکـەت: حـاجی محێـدین، کـەریم ئەفەنـدی، شـێخ قـادر ئەفەنـدی، عەبدوڕڕەحمان بـەگ، حەمەسـەعید حـاجی عەبـدوڵڵا، دەروێـش حەمەلەلە، سەید عەلی سەید مستەفا، مەلا سەعید فەتاح ئەفەنـدی، حـاجی ڕەشید؛

کەوشـدرووی مەملەکـەت: حـاجی سـاڵح حـاجی مـارف، حـاجی سـاڵح جولان، حاجی کەریم، عەلی ئاغا، حـاجی عەبدوڵڵا قەرەداغ، حـاجی ئـەمین سوور، ئۆستا عەزیز ئۆستا ئەحمەد، کاکە سەعید، حەمـە ڕەشـید، سـاڵح حەمە ڕەحیم؛

بەقاڵی مەملەکەت: مەلا فەرەج، حەمە شەریف گیرکە، عـەبوتیر، حەمـەی عەدلـە، حـاجی بـەقاڵ، مـەلا عەبدوڕڕەحمان، ئـەمین مـام سـاڵح، محەمـەد حەسەنە کەرە، غەفوور ئەمین دەروێش؛

ئاسـنگەری مەملەکـەت: حـاجی ڕەشـید حـاجی سـەعید، ئۆسـتا عەبدوڕڕەحمان ئۆستا تۆفیق؛ بە ئاشکرا ڕایانگەیانـد: ئـەو کەسـانە بـە نوێنـەری ناوچـەکە نـازانن و بڕوایـان پێیـان نییـە، چـونکە کـەس هەڵینەبژاردوون[416].

ڕیاسـەتی مالییـەی حکوومـەتی شێخ، سـەرەتای ١٩٢٤، پـووڵی چاپی دەرکـرد بـۆ ڕاییکردنـی کاروبـاری ڕەسمـیی دائیرەکـان: یـەک و هەشـت ئانـەیی، بـۆ تـاپۆیش پێنج ڕووپیـەیی. پاشان پـووڵی چوار ڕووپیـەیی و ڕووپیـەو نیـوی و یـەک ڕووپیەییشی دەرکرد[417]. ئەحمەد خواجە وتوویە:

---

[416] "ئومێدی ئیستیقلال، ژ٢٢، ١٠ نیسان ١٣٤٠، ل١-٣.

[417] هەمان سەرچاوە، ژ١٩، ٢٠مارت ١٣٤٠؛ ژ٢٠، ٢٧ مارت ١٣٤٠.

بیری پوول دەرکردن هی ئەو بوو، خۆی بە ئەنجامی گەیاند. شێخ لەتیفی دانسازیش زۆری یارمەتی دا بەوەی کە نێوان پوولەکانی بۆ کون کردو قەراغی بۆ دروست کردن[418].

ڕیاسەتی مالییە، هەر ئەو ماوەیە خەریکی ئامادەکردنی بڕێکی زۆر ئاڵتوونی سکەدارو بێسکە بوو تا لە سنووقدا بە بارمتە دایبنێ، بانقەنۆت (عملة ورقية- بانك نۆت) بەرانبەر بەو ئاڵتوونە چاپ بکات و بیخاتە بازاڕەوە[419]. بەڵام دیارە ڕووداوەکانی لەوەبەدوا، بەتایبەت تۆپباران و داگیرکردنەوەی شار، ئەوەندە خێراو کاریگەر بوون ئەم پرۆژەیەیان هەڵوەشاندوەتەوە.

١٩٢٤/٣/١٢ پێنج فڕۆکە ئاوایی‌ی (حەمەی سان ئەحمەد)ی ئەوبەری ڕووباری (سیروان)ی بۆمباردومان کرد. فڕۆکەیەکیان لێ کەوتە خوارەوە. ٣/١٦ لە ناوچەیەکی ڕوو بە شارەزوور ٢٠-٣٠ بۆمبا تەقێنرایەوە[420]. ڕۆژی ١٩٢٤/٥/٢٠ بەیاننامەیەکی زۆر بەسەر گەلێك ناوچەی ژێر دەستی شێخدا بەردرایەوە، هەڕەشەی بۆردومانکردنی هەموویانی تێدا کرابوو. ٥/٢٢ شێخیش بە نامە ئاگادار کرایەوە کە خۆی و چەکدارەکانی شار چۆڵ بکەن؛ ئیتر بۆ بیانووبڕینیان ڕوو بە قەرەداغ و سەنگاو بەجێی هێشت، دوای بۆردومانەکە هاتەوە[421].

---

[418] چیم دی، ب٢، ل٥٢-٥٣.

[419] ئومێدی ئیستیقلال، ژ٢٠، ٢٧ مارت ١٣٤٠.

[420] ئومێدی ئیستیقلال، ژ١٩،٢٠ مارت ١٣٤٠، ل٢.

[421] چیم دی، ب٢، ل٥٨، ٦٠؛ کەمال مەزهەر، گاڵتەوگەپ و گەمەکانی نێوان شێخ مەحموودو فڕۆکەوانە ئینگلیزەکان.

سلێمانی ١٩٢٤/٥/٢٥ جارێکی تر بۆردومان کرایەوە. ئەمجارە لەو بیست هەزار کەسەی دانیشتووی شار، تەنیا ٧٠٠ کەسی لێ مایەوە. ئەوانی تر دەربەدەری دێهات بوون، بە چوار مانگی تر ئەمجا گشتیان گەڕانەوە جێی خۆیان[٤٢٢]. ئەحمەد خواجە کە ئەو ڕۆژانە هاتوەتەوە ناو شار، دیویە: ((لە هەموو سەربان‌و ماڵێ بڵێسەی ئاگر هەڵئەستێ، خانوو وێران‌و کاول بەسەریەکدا ڕووخاوە، شاری چۆڵ‌و بێ‌خاوەن. لەژێر بۆمباو مەترالیۆزدا ژن‌و منداڵ‌و پیر کەوتبوونە دەشت، بەبێ خۆراک‌و ئاو بە پێی پێخواسی[٤٢٣])).

شێخ هەر لە هەوڵی دەستگرتندا بوو بەسەر ئەو ناوچانەدا کە لێی قەدەغە کرابوون. دوا بۆردومانی شاریش، کاروباری کەم‌وزۆر لە گرێژەنە برد. دواجار مەندووبی سامی بڕیاری دا هێزی پیادە سلێمانی داگیر بکات. ئەوە بوو ڕەتلێکی سوپای عەرەبی‌ی عێراق بە پاڵپشتی هێزی پۆلیس‌و هێزێکی لیڤی‌ی ئاسووری‌و هێزی ئاسمانی‌ی بریتانیا، ڕۆژی ١٩٢٤/٧/١٩ سلێمانیی گرتەوە، "چاپمان" کرایە سەرپەرشتی ئیداری‌ی شار[٤٢٤]، لەکاتێکدا شێخ پێش چەند ڕۆژێك سلێمانیی چۆڵ کردبوو[٤٢٥].

---

[٤٢٢] کەمال مەزهەر، هەمان سەرچاوە.

[٤٢٣] چیم دی، ب٢، ل٥٨، ٥٩.

[٤٢٤] کرد وترك وعرب، ص٣٤٨؛ تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ص٢٧٢؛ عبدالعزيز ياملكي، كشف القناع عن بعض الوقائع العراقية، ج١، بغداد، ١٩٥٧، ص١٢، ٢٠؛ عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، ص٣٤٠ (لە ژمارە ١٠٤ی ١٩٢٤/٧/٢٥ی ڕۆژنامەی "العالم العربي)یەوە وەرگیراوە).

شكانی هێزەکەی شێخ کاتی بوو، چونکە توانیی دوای ماوەیەکی کورت سلێمانی بگرێتەوەو سوپای عیراق دەرپەڕێنێ و تا ڕۆژاوای دەربەند دوویان بکەوێ. بەڵام ئەمجارە سریەیەکی بەتالیۆنی سوارەی سێیەم و سریەی پیادەی فەوجی دووەم و سریەی پیادە پاڵپشت بە بەتەریەی تۆپخانەی عەیاری ٢,٧٥ گرێ، لە ٧/٢٠ بەدواوە سلێمانیی بۆ دووەم کەرەت داگیر کردەوە. تۆپخانەی عیراقی بۆ یەکەمجار بەشداریی ڕاستەقینەی لەو شەڕەدا کرد. حکوومەتی عیراق هاوزەمان بە بەلاغێکی ڕەسمی سوپاسی هێزی ئاسمانیی شاهانەی ئینگلیزو تیپی شەشەمی هێزی زرێپۆشی گەرۆکی کرد بۆ یارمەتی و کۆششەکانی لە شەڕدا[٤٢٦].

سوپای عیراق لە ٢٠-١٩٢٤/٨/٣٠ چەندین هێرش و پەلاماری بردە سەر هێزەکەی شێخ، ئەنجامێکی ئەوتۆی بەدی نەهێنا. شێخ هاوپەیمانیی لەگەڵ عەشایەری هەمەوەندو هەوراماندا تازە کردەوە، دەستی کێشایەوە بەسەر ناوچەکانی پێنجوێن و سەرچناردا. بەڵام ئەو پەلامارە بەردەوامانەو زەبری فڕۆکەکانی ئینگلیز، دواجار هێزەکەی شێخی ماندوو و چالاکییەکانیی کەم کردەوە. حکوومەتی عیراقیش لە ١٩٢٤/١٢/٢٧دا لە بەلاغێکی ڕەسمیدا جەختی کردەوە کە حاڵ وباری ناوشاری سلێمانی ڕوو لەچاکییەو ژمارەی دانیشتوانی زۆر زیادی کردووە[٤٢٧].

---

[٤٢٥] چیم دی، ب٢، ل٦٤.

[٤٢٦] عبدالرحمن إدریس صالح البیاتی، ص٣٤١ (لە هەمان ژمارەی پێشووی "العالم العربی"یەوە وەرگیراوە).

[٤٢٧] هەمان سەرچاوە، ل٣٤٢، ٣٤٤.

لەوکاتەیشەوە تۆماری ژیانی ئەم سێیەم حکوومەتەی شێخ بەتەواوی پێچرایەوە، سێیەم خولی حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز لە سلێمانی دەستی پێکرد تا ١٩٢٥/٣/٧ کە ئیتر ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی تێدا بە یەکەم موتەسەڕیفی سەردەمی حکوومەتی پاشایەتی لێ دانرا.

---

جێی وتنە، بەپێی ژمارە ٢٣٥ی ١٩٢٤/١٢/٢٧ی "العالم العربي"، ژمارەی دانیشتوانی شار لە ١٩٢٤/١٢/١٥دا بە نزیکەی ٢٠٠٠٠ کەس مەزەندە کراوە.

## سەرچاوەکان:

### ١. کوردی:

### ١. ١. کتێب:

١- احمد خواجە، چیم دی، ب ١، بغداد، ١٩٦٨و، ب٢، سلێمانی، ١٩٦٩و، ب٣، سلێمانی، ١٩٧٠.

٢- جەلال تەقی، بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو سمکۆ، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٨.

٣- ڕەفیق سالح، ڕۆژنامەکانی سەردەمی حوکمی شێخ مەحموود، لەسەرنووسینی سدیق سالح، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٤- ڕەفیق سالح، ڕۆژنامەی ژیان، ب١ (ژمارە ١-٨١)، لێکۆڵینەوەی سدیق سالح، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٥- رفیق حلمی، یادداشت، چ٢، هەردوو بەشی یەکەمو دووەم، هەولێر، ١٩٨٨و، بەشی سێهەم، بغداد، ١٩٩٢.

٦- رمزی قزاز، بزووتنەوەی سیاسی و ڕۆشنبیری‌ی کورد لەکۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە تا ناوەڕاستی چەرخی بیست، سلێمانی، ١٩٧١.

٧- سدیق سالح، بەسەرهاتووی کاکەڕەشید شەوقی (سەرگوزشتە)، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٨- سیروان بەکر سامی و عەلی ناجی کاکە حەمە ئەمین عەتار، پێشکەوتن یەکەمین ڕۆژنامەی سلێمانی ١٩٢٠-١٩٢٢، هەولێر، ١٩٩٨.

٩- عبدالرقيب يوسف و سديق سالح، بيرەوەریەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری، سلێمانی، ٢٠٠١.
١٠- عبدالرقيب يوسف، لە بەڵگەنامەکانی حکوومەتی شێخ مەحموود: تۆمارێکی شارەوانیی سلێمانی (١٩٢٣-١٩٢٤)، بنکەی ژین- سلێمانی، ٢٠٠٥.
١١- مەلا عەبدوڵڵای زێوەر، گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، محمدی مەلا کریم هێناونیەتە سەر شێوە نووسینی نوێ و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیون، بەغدا، ١٩٨٥.
١٢- کەمال نوری مەعرووف، یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، دهۆک، ١٩٩٥.
١٣- م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب١، لەندەن، ١٩٩٠" ب٢، لەندەن، ١٩٩١.
١٤- محمد رسول هاوار، سمکۆ (ئیسماعیل خانی شوکاك)و بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، چاپخانەی ئاپێك-سوید، ١٩٩٦.
١٥- مستەفا نەریمان، ببلیۆگرافیای کتێبی کوردی ١٧٨٧-١٩٧٥، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد-بەغدا، ١٩٧٧.
١٦- مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، بغداد، ١٩٨٥.
١٧- یادداشتەکانی مێجەر نۆئیل لە کوردستان، وەرگێڕانی حسین احمد جاف و حسین عوسمان نێرگسەجاڕی، بغداد، ١٩٨٤.

**١. ٢. گۆڤارو ڕۆژنامە:**

١- اسماعیل حقی شاوەیس، حکومەتی کوردستان، "ڕۆژی نوێ" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ٥، ئابی ١٩٦٠.

٢- سدیق سالّح، ڕەشید کابان نوێنەرێکی کوردستانی باشوور (ساڵی ١٩١٩)، "پەیڤین" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ ٤، دیسەمبەری ١٩٩٨.

٣- سدیق سالّح، بەڵگەنامەیەکی دووەم حکومەتی کوردستانی باشوور، "هەزارمێرد" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ٦، کانوونی یەکەمی ١٩٩٨.

٤- سدیق سالّح، شەجەرەکەی بنەماڵەی صائیب، "پەیڤین" (گۆڤار)، ژ٦، حوزەیرانی ١٩٩٩.

٥- سدیق سالّح، (مەفرەزەی موحافیظی سواری-مایسی ١٩٢٣) لە بەڵگەنامەیەکدا، "هەزارمێرد"، ژ١٨، کانوونی یەکەمی ٢٠٠١.

٦- سی.جەی. ئەدمۆندز، بیبلیۆگرافیای چاپکراوی کوردیی باشوور، وەرگێڕانی سەلمان عەلی، ١٩٢٠-١٩٣٦، گۆڤاری شاهانەی ناوەندی ئاسیا، لەندەن، ب٢٥، بەشی ٣، تەمووزی ١٩٣٧و، ١٩٣٧-١٩٤٤، هەمان سەرچاوە، ب٣٢، بەشی ٢، مایسی ١٩٤٥.

٧- عبدالرقیب یوسف، لە کەلەپووری بەڵگەنامەیی کوردی، "ڕۆشنبیری نوێ" (گۆڤار)، بەغدا، ژ ١١٠، حوزەیرانی ١٩٨٦.

٨- کەمال ڕەئووف محەمەد، ١٩١٨/١١/١٥ نەك ١٩١٨/١١/١ یەکەم حکومەتی کوردستان دامەزرا، "کوردستانی نوێ" (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژ ١١٦٦، ١٩٩٥/١٢/١٥و، یێکەم حکومەتی کوردستان ١٩١٨/١١/١٧ نەك ١٩١٨/١١/١ دامەزراوە، "کوردستانی نوێ"، سلێمانی، ژ ١٤٣٤، ١٩٩٧/٧/١٠.

٩- د.کەمال مەزهەر، چمکێك لە مێژووی یەکەم چاپخانەی کوردی لە شاری سلێمانی، "ڕۆشنبیری نوێ"، ژ٧٧، تشرینی یەکەمی ١٩٧٩.

١٠- كەمال مەزهەر، كاڵتەوگەپ و گەمەكانى نێوان شێخ مەحموودو فرۆكەوانە ئینگلیزەكان، ژ ١٣٦، ١٩٩٥.
١١- هەڵۆ، روون كردنەوەيەك دەربارەی هەندێك لە باسەكانی چيم دی، "بەيان" (گۆڤار)، بەغدا، ژ٥، كانوونی دووەمی ١٩٧١.

٢. عەرەبی:

٢. ١. كتێب:

١- ارنلد تي. ويلسون، بلاد مابين النهرين بين ولاءين، ترجمة فؤاد جميل، ط ١، ج٣، بغداد، ١٩٩٢.
٢- اي. إم. هاملتون، طريق في كردستان، ترجمة جرجيس فتح الله، مطبعة دار الجاحظ- بغداد، ١٩٧٣.
٣- المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، ترجمة جعفر الخياط، ط٢، بغداد، ١٩٧١.
٤- توفيق وهبي، حول مقال مسؤولية الاديب الكردي الكبرى للاستاذ عبدالمجيد لطفي، بغداد، ١٩٧٣ (عني بنشره محمد الملا عبدالكريم).
٥- جمال بابان، مذكرات علي كمال عبدالرحمن، شركة الخنساء للطباعة المحدودة- بغداد، ٢٠٠١.
٦- جرجيس فتح الله، يقظة الكرد، دار ئاراس- أربيل، ٢٠٠٢.
٧- جليلي جليل واخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة عبدي حاجي، بيروت، ١٩٩٥.
٨- دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان، ترجمة فؤاد جميل، الجزءان الاول والثاني، بغداد، ١٩٧٣.

٩- سي.جي. ادموندز، كرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد، ١٩٧١.

١٠- عبدالرحمن إدريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد "البرزنجي" والنفوذ البريطاني في كردستان العراق حتى عام ١٩٢٥، دار الحكمة- لندن، آذار ٢٠٠٥.

١١- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط٥، ج١، بيروت، ١٩٧٨.

١٢- عبدالعزيز ياملكي، كشف القناع عن بعض الوقائع العراقية، ج١، بغداد، ١٩٥٧.

١٣- الدكتور فاضل حسين، مشكلة الموصل، ط٢، مطبعة اسعد-بغداد، ١٩٦٧.

١٤- مذكرات القادري في بيان الثورة الروسية وايضاح غوامضها، نقله الى العربية القاسم العاوي، المطبعة العصرية-بغداد، ١٩٢٥.

١٥- الدكتور كمال مظهر احمد، اضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط، بغداد، ١٩٧٩.

١٦- مير بصري، اعلام الكرد، رياض الريس للكتب والنشر-لندن-قبرص، ديسمبر ١٩٩١.

١٧- د.وليد حمدي، الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، لندن، ١٩٩١.

١٨- الحكومة العراقية/ وزارت العدلية، مجموعة البيانات والنظامات العدلية ماصدر بين ١/١٠/١٩٢٠-٣١/١٢/١٩٢٢ من قوانين، مطبعة العراق-بغداد.

٢. ٢. گۆڤارو ڕۆژنامە:

١- الدكتور احمد عثمان ابوبكر، كردستان في عهد السلام، القسم الاول، "الثقافة" (مجلة)، بغداد، العدد٨، اب ١٩٧٩، ص٣٨-٤٨، والقسم الثامن، نفس المصدر، العدد ٧، تموز ١٩٨٠، ص٤٥-٥٤، والقسم التاسع، نفس المصدر، العدد ٨، اب ١٩٨٠، ص ٣٤-٤٦، والقسم العاشر، نفس المصدر، العدد ٩، ايلول ١٩٨٠، ص٩٢-١٠٣، والقسم الثاني عشر، العدادان ١١-١٢، تشرين الثاني-كانون الاول ١٩٨٠، ص٦٨-٧٦، و القسم الثامن عشر، العددان ١٠-١١، تشرين الاول-تشرين الثاني ١٩٨١، ص٧٠-٧٨، والقسم الثالث والعشرون، العدد ١، كانون الثاني ١٩٨٣، ص٥٨-٦٧.

٢-دافيد كورن، رجلان اقحما الاكراد بالعراق: مناورات كوكس-ولسن، ترجمة د.حميد عبدالملك، ا، "الاتحاد" (جريدة)، السليمانية، العدد ٣٢٣، ١٩٩٩/٦/١٨، /٢ العدد ٣٢٤، ١٩٩٩/٦/٢٥، /٣-٤، العدد ٣٢٥، ١٩٩٩/٧/٢،/ الحلقة الاخيرة، العدد ٣٢٦، ١٩٩٩/٧/٩.

٣- ك، صفحات من الماضي يرويها الاستاذ فؤاد مستي، "التآخي" (جريدة)، بغداد، العدد ١٥٨٢، ١٩٧٤/١/٢١.

٤- دراسة تحليلية لمستقبل كردستان السياسي/١، "الاتحاد"، العدد ٤٣١، ٢٠٠١/٧/٢٧.

دوورگەی ئەندامان

Goodall & Darby, The University Atlas, ٢nd ed., London, ١٩٤٠, PP. ٦٢-٦٣.

مووسڵ
هەولێر
ئێران
سلێمانی
کەرکووک
• نەخشەی ئەو هەرێمە کە ویلسن
بۆ حکوومەتەکەی شێخی دیاری کردبوو
٢٠٠ ١٥٠ ١٠٠ ٥٠ ٠ ٥٠
پێوەر : کیلۆمەتر

